# چل حەدیسێن ئیمامێ نەوەوەی
# وەرگێڕان و شرۆڤەکرن

( د گەل تماميا وان يا ئبن رەجەبێ حەنبەلی )

تەحسين ئيبراهيم دۆسکی

# پێشگۆتن

حەمد وسوپاسی هەمی بۆ وی خودایی بن یێ ئیسلام بۆ مە هلبژارتی دا ببتە دین ورێبازا ژینێ، نعمەتا خۆ ل سەر مە ب تمامکرنا دینێ مە پێک ئینا، بۆ مە تمام کر، وئوممەتا مە کرە باشترین ئوممەت.. وصەلات وسەلام ل پێغەمبەرێ وی موحەممەدی بن، ئەو ب پەیڤێن کۆمکەر د ناڤ مە دا هاتیە هنارتن، وی رێک بۆ مە ئاشکەرا کر، وبەرێ مە دایێ، و ل بنەمال وهەڤالێن وی هەمیان ژی بن، صەلاتەکا تمام وبەردەوام حەتا رۆژا دویماهییێ.

خواندەڤانێن هێژا: ئیمامێ بوخاری وموسلم هەردو ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزن، دبێژت: ﴿ بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ ﴾ یەعنی: خودێ ئەزێ ب پەیڤێن کۆمکەر هنارتیم. ورامانا ڤێ حەدیسێ -وەکی زانایێ ناڤدار ئیمامێ زوهری دبێژت- ئەوە ئەو کارێن گەلەک یێن کو د کیتابێن بەرێ دا هاتین، خودایێ مەزن بۆ وی د کارەکی ودووان دا کۆم کرینە.

مەعنا: ئێک ژ تایبەتمەندییێن کو خودایێ مەزن داینە پێغەمبەرێ خۆ یێ دویماهییێ -سلاڤ لێ بن- ئەوە وی هندەک گۆتن یێن گۆتین ب هژمارا پەیڤان ڤە دکێم وکورتن، بەلێ د مەعنا ورامانێن خۆ دا ئەو دگەلەک وبۆشن. وئەو تشتێ د کیتابێن بەرێ دا ب هندەک پەیڤ ورستەیێن درێژ دهاتنە ئاشکەراکرن ژ ئەحکام وحیکمەتان، د کیتابا پێغەمبەرێ دویماهییێ دا و د وان گۆتنان دا یێن ل سەر ئەزمانێ وی گەریاین، ب هندەک پەیڤ

ورستەییێن کورت هاتینە ڕاگەهاندن.. تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ کو صەحابییێن وی بشێن ب ساناهی وان گۆتنان ژ بەر بکەن، و ب تمامی بۆ جیلێن پشتی خۆ ڤەگێرن.

وپشتی چاخێ نڤیسینێ د ناڤ ئوممەتێ دا دەست پێ کری، ئەوێ دبێژنێ: (عصر التدوین)، گەلەک زانایان بەرگەریان کریە کو هەر ئێک ل دویڤ زانین وتێگەهشتنا خۆ هندەک ژ ڤان حەدیسان کۆم بکەت، ئەوێن وان ب سەنەدێن خۆ ریوایەت کرین، و د هندەک کتێب ونامیلکەیێن تایبەت دا ل بەر دەستێ خواندەڤانان بدانن، دا مفا ژێ بێتە وەرگرتن، وپشتی وان هندەک زانایێن دی هاتینە وئەم حەدیس شرۆڤەکرینە، وگەلەک ئەحکام ژێ دەرێخستینە، و ل بەر دەست دانایینە، وئێک ژ ناڤدارترین وان کۆمێن حەدیسان، ئەو کۆمە یا زانایێ حەدیسێ یێ مەزن ئیمام ئبن صەلاحێ شەهرەزۆری ل بن ناڤێ (الأحاديث الكلية) دانای، کو ژ (٢٦) حەدیسان پێک دهات یێن وی دیتن کو ئەڤ دینە ل دۆر دزڤرت، پاشی پشتی وی زانایێ مەزن ئیمامێ نەوەوەی هات وهندەک حەدیسێن دی لێ زێدەکرن حەتا هژمارا وان بوویە (٤٢) حەدیس، وئەڤ کۆمە ب ناڤێ (الأربعين النووية) ناڤدار بوو، و د ناڤ ئوممەتێ دا بەلاڤبوو، ومفایەکێ مەزن ژێ هاتە وەرگرتن، وپشتی وی زانایێ ناڤدار ئبن رەجەب هات وهەشت حەدیسێن دی لێ زێدەکرن، وهژمار بوو (٥٠) وپاشی هەر وی ئەڤ حەدیسە د کتێبەکا تایبەت دا شرۆڤەکرن ل بن ناڤێ (جامع العلوم والحكم في شرح خمسين حديثاً من جوامع الكلم)، وئەڤ کتێبە ژی د ناڤ ئوممەتێ دا بەلاڤ بوو وخەلکی مفایەکێ زێدە بۆ خۆ ژێ وەرگرت، وگەلەک سەیدایان خەم ژ ڤێ کتێبێ خوار، چ ب چاپکرنا وێ بت، یان ب دانانا هندەک حاشیە وتەعلیقان بت ل سەر، یان ب کورتکرنا وێ بت، دا پتر مفا ژێ بێتە وەرگرتن، وئێک ژ باشترین کورتکرنێن وێ ئەوە یا (د. أحمد بن عثمان المزيد) پێ ڕابووی، ومە ژی ژ لایێ خۆ ڤە دیت کو ئەم پال بدەینە سەر کورتکرنا وی بۆ دانانا شرۆڤەکرنەکا زێدە کورت ب زمانێ کوردی ل سەر ڤان حەدیسان، هەر وەسا

بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ کتێبێ مە مفایەکێ زێدە ژ کتێبا (قواعد وفوائد من الأربعين النووية) ژێ وەرگرت یا سەیدا (ناظم محمد سلطان) نڤیسی.

هیڤیا مە ژ خودایێ مەزن ئەوە ئەو ببتە جهێ مفای بۆ خواندەڤانان، وخێرا هەر ئێکی بنڤیست یێ دەست د بەلاڤکرنا ڤان حەدیسان دا هەی، وخودێ هاریکارێ مە هەمیان بت.

# حەدیسا ئێکێ

عن عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رَضِيَ الله عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ﴿ إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّـيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُـلِّ امْـرِئٍ مَـا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى الله وَرَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى الله وَرَسُـولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَـا، فَهِجْرَتُـهُ إِلَى مَـا هَاجَرَ إِلَيْهِ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عومەرێ کورێ خەطـطـابی -خودێ ژێ رازی بـت- دئێتـە ڤـەگوهاسـتن، دبـێژت: مـن گـوه ل پـێغـەمـبـەری بوو -سلاڤ لێ بن-، دگۆت: هـەمـا کـار ب ئنیەتانە، وهەما هەر مرۆڤەکی ئەو ئنیەت بۆ هەیـە یـا وی کریـە دلـێ خـۆ، ڤێجـا هـەچیـێ مـشـەختبوونـا وی بـۆ خـودێ وپێغـەمبـەرێ وی بـت، ئـەوی مشەختبوونا وی بۆ خودێ وپێغەمبەرێ وییـە، وهـەچیـێ مـشـەختبوونـا وی بـۆ دنیایەکێ بت دا بگەهتێ، یان ژنکەکێ دا مـارە بکـەت، ئـەوی مـشـەختبوونـا وی بۆ وی تشتیە یێ ئەو بۆ مشەختبووی.

بوخاری وموسلم ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزن

ئـەڤ حـەدیسـە ئـێـک ژ وان حـەدیسـانـە یـێـن دین ل دۆر دزڤرت، حـەتـا ژ ئیمامێ شافعی دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: ئەڤ حەدیسە سێئێکا زانینێیە، وئەو حەفتێ دەرگەهێن فقهی ڤەدگرت.

هەر وەسا ژ ئیمام ئەحمەدی دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: بناخەیێن ئیسلامێ ل سەر سێ حەدیسانە.. ئێک ژ وان حەدیسان ئەڤ حەدیسەیە.

ویێغەمبەر سلاڤ لێ بن دەمێ دبێژت: (**هەما کار ب ئنیەتانە**) مەعنا وێ ئەوە هەر کارەکێ ژ لایێ مرۆڤی ڤە دئێتەکرن، حەتا کارەکێ دورست بت، دڤێت ئنیەتا خودانی پێ یا دورست بت، وی بۆ خودێ ئەو کربت، لەوا د دویڤ دا گۆت: (**وهەما هەر مرۆڤەکی ئەو ئنیەت بۆ هەیە یا وی کریە دلێ خۆ**) یەعنی: کانێ ئنیەتا وی کریە دلێ خۆ ژ کرنا وی کاری چیە، ل دویڤ وێ ئنیەتێ خودێ خێرێ دێ دەتێ، ئەگەر ئنیەتەکا باش وی هەبت، خودێ خێرێ دێ دەتێ، وئەگەر ئنیەتەکا خراب وی هەبت، خودێ چو خێرێ نادەتێ، بەلکی دێ بۆ وی گونەه بت.

ژ ڤێ دئێتە زانین کو حوکم ل سەر هەر کارەکی، کانێ یێ باشە یان یێ خرابە، ل سەر وێ ئنیەتێ ڕادوەستت یا خودانی د پشت کرنا وی کاری ڕا هەی.

وئنیەت ئەو مەخسەد وئارمانجە یا مرۆڤی ب کرنا کاری هەی، یا کو دکەفتە دلێ وی، دەمێ ئەو پێ ڕادبت، کانێ ئەو دێ وی کاری بۆ خودێ کەت، یان وی ژبلی خودێ یان د گەل خودێ ئارمانجەکا دی ژێ پێ هەیە، و ب ڤێ ئنیەتێیە کار ژێک دئێنە جوداکرن، وئیخلاصا مرۆڤی پێ دئێتە زانین، ژ بەر هندێ زانایێن ئوممەتێ یێن پێشییێ خەمەکا خەم ژ ئنیەتێ دخوار، عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی دگۆت: بەلکی کارەکێ بچویک هەبت ئنیەت وی مەزن بکەت، وبەلکی کارەکێ مەزن هەبت ئنیەت وی بچویک بکەت. ویەحیایێ کوڕێ ئەبوو کەثیری دبێژت: هوین خۆ فێری ئنیەتێ بکەن، چونکی ئنیەت ژ کاری ب زەحمەتترە.

ویێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا نموونەیەکێ دئینت بۆ مە ژێ ئاشکەرا بت کانێ چاوا ئنیەت کارتێکرن ل سەر کاری هەیە، ئەو ژێ (مەشختبوونە)، ومشەختبوون د بناخەیێ خۆ دا ئەوە مرۆڤ وی جهی بهێلت

یێ کوفر ل سەر زالبووی، وخۆ ڤەگوهێزتە وی جهی یێ ئیسلامێ دەسهەلات لێ هەی، وەکی صەحابیان دەمێ ژ مەکەهێ چووینە مەدینێ.. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا کر کو ئەڤ مشەختبوونە هەر چەندە ل بەر چاڤ ئێک کارە ژی، بەلێ ئەو ل دویڤ ئارمانج ومەخسەدا خودانی دئێتە گوهارتن، هەچییێ جهێ خۆ هێلابت، وبۆ خودێ وپێخەمەت رازیبوونا وی، و ژ بەر پێغەمبەری وڤیانا وی مشەخت ببت، دا دینێ خودێ ب سەر بێخت، وخۆ فێری ئیسلامێ بکەت، وبشێت وان ئەحکامێن ئیسلامێ ب کار بینت یێن وی نەدشیا ل وەلاتێ کوفرێ ب کار بینت، ئەوی مشەختبوونا وی بۆ خودێ وپێغەمبەرێ وییە، مەعنا: ئارمانجا وی دێ ب جهـ ئێت، وخودێ خێرا وی دێ ب تمامی دەتێ.

وهەچییێ مشەختبوونا وی بۆ دنیایەکێ بت دا بگەهتێ، یان ژنکەکێ دا مارە بکەت، ئەوی مشەختبوونا وی بۆ وی تشتیە یێ ئەو بۆ مشەختبووی، یێ ئێکێ بازرگانە، ویێ دووێ داخوازکەرێ ژنێیە، وکەس ژ وان بۆ خودێ مشەخت نەبوویە، وچو خێر ناگەهتێ.

وهەر کارەکێ هەبت د ڤێ مەعنایێ دا وەکی مشەختبوونێیە، خودێ ل دویڤ ئنیەتا خودانی دێ دەتێ، بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن، کو جارەکێ پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتەکرن ل دۆر وی کەسی یێ شەڕی بۆ ریمەتی دکەت، ووی یێ بۆ زیرەکی ومەدحە دکەت، ووی یێ بۆ تۆخم پەرێسییێ دکەت، کانێ کی ژ وان د رێکا خودێ دایە؟ وی گۆت: ﴿ مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله ﴾ هەچییێ شەڕی بکەت دا پەیڤا خودێ یا بلند بت، ئەوی شەڕێ وی د رێکا خودێ دایە.

وئەو کەسێ کارێ باش دکەت وئنیەتا وی نە بۆ خودێ بت، کارێ وی دبتە ریمەتی، وریمەتی شرکە وشرک کاری پویچ دکەت، موسلم ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت، دبێژت: ﴿ قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ

عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ ﴾ خودايێ مەزن دبێژت: ئەز ژ هەمی شریکان بێ منەترم ژ شریکاتییێ، هەچییێ کارەکی بکەت ئێکێ دی تێدا بکەتە شریک بۆ من، ئەزدێ وی وشرکا وی هێلم.

بەلێ ئەگەر مرۆڤ کارەکێ باش بۆ خودێ ب تنێ بکەت، پاشی ئارمانجەکا دی ژی بۆ وی ژ وی کاری چێببوو، ریمەتی تێدا نەبت، وەکی وی یێ بۆ خودێ علمی نیشا خەلکی بدەت، وحەز بکەت هندەک پارە بگەهنێ، ئەڤە کاری پویچ ناکەت، یان کارەکێ باش بۆ خودێ بکەت، وخەلک مەدحێن وی سەرا وی کاری بکەن، ڤێجا کەیفا وی بێت، ئەڤە ژی کارێ وی پویچ ناکەت، وخێرا وی بەطال ناکەت.

وهەژیە ل دویماهیێ بێژین: جهێ ئنیەتێ دلە، وواجب نینە مرۆڤ د چو کار وعیبادەتان دا ئنیەتێ ب ئەزمانی بێژت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە دەلیلە کو ئنیەت شەرتە بۆ هەر کارەکی، وئەو کارێ عیبادەت بت وبێ ئنیەت بێتە کرن نائێتە قەبویلکرن.

٢- فەرە ل سەر موسلمانی بەری کرنا هەر کارەکی ئەو حوکمێ وی بزانت، کانێ ئەو یێ دورستە یان نە، دا پشتی هنگی بزانت کانێ ئەو وی بکەت یان نە.

٣- ئنیەت ژ باوەرییێیە؛ چونکی ئەو کارێ دلیە، وکارێ دلی ژی ل نک سوننیان دکەڤتە د بن ڕامانا باوەرییێ ڤە.

## حەدیسا دووێ

عن عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْـنُ عِنْـدَ رَسُـولِ الله صـلى الله عليه وسلم ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَـنِ الإِسْـلاَمِ. فَقَـالَ رَسُـولُ الله صلى الله عليه وسلم: ﴿ الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَـاةَ، وَتَـصُومَ رَمَـضَانَ، وَتَحُـجَّ الْبَيْتَ، إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً ﴾. قَالَ: صَـدَقْتَ. قَـالَ: فَعَجِبْنَـا لَـهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيـمَانِ. قَـالَ: ﴿ أَنْ تُـؤْمِنَ بِـالله، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِـرِ، وَتُـؤْمِــنَ بِـــالْقَدَرِ خَـيْرِهِ وَشَرِّهِ ﴾. قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ. قَالَ: ﴿ أَنْ تَعْبُدَ اللهَّ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُـنْ تَـرَاهُ فَإِنَّـهُ يَـرَاكَ ﴾. قَـالَ: فَـأَخْبِرْنِي عَـنِ السَّاعَةِ. قَالَ: ﴿ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ ﴾. قَالَ: فَـأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا. قَالَ: ﴿ أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَـةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ ﴾. قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثْـتُ مَلِيًّـا، ثُـمَّ قَالَ لِي: ﴿ يَا عُمَرُ أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟ ﴾. قُلْتُ: الله وَرَسُـولُهُ أَعْلَـمُ. قَالَ: ﴿ فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ ﴾.

رواه مسلم

عومەرێ كورێ خەططابی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: رۆژەكێ ئەم ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- درووینشتی بووین، مە هند دیت زەلامەک هاتە نک مە، جلکێن وی گەلەک دسپیی بوون، ومویێ سەرێ وی گەلەکێ رەش بوو، نیشانێن سەفەرێ ل سەر نەدهاتنە دیتن، وکەسێ ژ مە ئەو نەدنیاسی، هات حەتا ل نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رووینشتی، وچۆکێن خۆ ب چۆکێن وی ڤەناین، ودەستێن خۆ داناینە سەر رانێن خۆ، وگۆت: ئەی موحەممەد، بەحسێ ئیسلامێ بۆ من بکە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئیسلام ئەوە تو شاهدەیێ بدەی کو ژ ئەللاهی پێڤەتر چو خودایێن ب حەق نینن وکو موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە، وتو نڤێژێ بکەی، وزەکاتێ بدەی، ورەمەزانێ یێ ب رۆژی بی، وبچیە حەجێ ئەگەر رێیا تە هەبت. وی گۆت: تو راست دبێژی، گۆت: ئینا ئەم ژێ عەجێبگرتی بووین، ئەو یێ پسیارێ دکەت ودبێژتێ: تو راست دبێژی!

گۆت: پا بەحسێ باوەریێ بۆ من بکە. گۆت: کو تو باوەریێ ب خودێ بینی، و ب ملیاکەتێن وی، وکتێبێن وی، وپێغەمبەرێن وی، و ب رۆژا دویماهیێ، وتو باوەریێ ب قەدەرێ بینی باشی وخرابیا وێ. گۆت: تو راست دبێژی.

گۆت: پا بەحسێ قەنجییێ بۆ من بکە. گۆت: کو تو وەسا پەرستنا خودێ بکەی هەر وەکی تو وی دبینی؛ چونکی ئەگەر تو وی نەبینی ژی، ئەو تە دبینت.

گۆت: پا بەحسێ قیامەتێ بۆ من بکە. گۆت: ئەوێ پسیار ژێ دئێتەکرن ژ وی چێتر نزانت یێ پسیارێ دکەت، گۆت: پا بەحسێ نیشانێن وێ بۆ من بکە. گۆت: کو ژنێ خاتوینا خۆ ببت، وکو تو ببینی پێخواس وروویس وهەژار، شڤانێن بزنان ئاڤاهیان بلند بکەن.

گۆت: پاشی ئەو چوو، وئەز بێنەکا خۆش مام، پاشی وی گۆتە من: ئەی عومەر، تو دزانی ئەو کی بوو پسیار کری؟ من گۆت: خودێ وپێغەمبەرێ

وی چێتر دزانن، گـۆت: ئـەو جبریـل بـووی هـاتی دینـێ هـەوە نیـشا هـەوە ددەت.

موسلم ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزت.

وئەڤە ژی حەدیسەکا مەزنە شرۆڤەکرنا دینی هەمییێ د ناڤ خۆ دا دگرت، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل دویماهییێ گۆت: (**ئەو جبریل بووی هـاتی دینێ هەوە نیشا هەوە ددەت**). ویێ باش هزرا خۆ د ڤێ حەدیسێ دا بکەت دێ زانت کو زانینێ هەمییێ ڤەدگرت، وئەو تشتێ زانایێن ئومـمەتێ بـەحس ژێ دکەن د ڤێ دەرناکەڤت یا د ڤێ حەدیسێ دا هاتی.

د ڤێ گۆتنا خۆ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیسلام ب هندەک کـاران دا نیاسین کو ب ئەندامێن لەشی دئێنەکرن، وگـۆت: (**ئیسلام ئـەوە تـو شاهدەیێ بدەی کو ژ ئەللاهی پێڤـەتر چو خودایێن ب حەق نینن وکو موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە، وتو نڤێژێ بکەی، وزەکاتێ بدەی، ورەمەزانێ یێ ب رۆژی بی، وبچیە حەجێ ئەگەر رێیا تە هەبت**). وئەڤە هندێ دگەهینت کو ئەو کارێن باش یێن ب ئەندامێن لەشی دئێنەکرن، ورازیبوونـا خـودێ تێدا هەبت، دکەڤنە د بن رامانا ناڤێ ئیسلامێ دا.

ووی بـاوەری (ئیمـان) ب وان عـەقیـدەیان ڤـە گرێدا یێن کو د دلی دا دئێنە ڤەشارتن، وپێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ئەو ب شەش بناخەیان ڤـە گرێدان: (**ب خودێ، و ب ملیاکەتێن وی، وکتێبێن وی، وپێغەمبەرێن وی، و ب رۆژا دویماهییێ، و ب قەدەرێ باشی وخرابیا وێ**). ووەکی ئاشکەرا باوەریا ب قەدەرێ ژی ئێک ژ بناخەیێن باوەرییێنە، لەو عەبدللاهێ کورێ عومـەری ئـەڤ حەدیسە بـۆ خـۆ کـرە دەلیل دژی وێ دەستەکێ یا باوەری ب قـەدەرێ نـەئینـای، وئاشکەرا کر کو کـارێ وان ژ وان نائێتـە قـەبـویلکرن ئەگەر ئەو باوەرییێ ب قەدەرێ ژی نەئینن.

وبەلكى كەسەک هەبت هزر بكەت كو ئەڤ حەدیسە كاری ژ باوەریێ حسێب ناكەت، وئەو ب خۆ وەسا نینە، ئیمامێ شافعی ژ صەحابی وتابعیان وجیلێ پشتی وان ژی ڤەدگوهێزت كو (ئیجماعا) وان ل سەر هندێ چێبوویە كو باوەری گۆتن وكار وئنیەتە، مەعنا: كار دكەڤتە د بن رامانا باوەریێ ڤە، وپێغەمبەر ب خۆ ژی -سلاڤ لێ بن- د هندەک گۆتنێن خۆ یێن دی دا ئاشكەرا دكەت كو كار ژ باوەرییێنە، وەكی د وێ حەدیسێ دا هاتی یا بوخاری وموسلم هەردو ڤەدگوهێزن، ئەوا دبێژت: ﴿ الإِيـَانُ بِـضْعٌ وَسَـبْعُونَ، أَوْ بِـضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ الله، وَأَدْنَاهَـا إِمَاطَـةُ الأَذَى عَـنِ الطَّرِيـقِ، وَالحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيـَانِ ﴾ یەعنی: باوەری حەفتێ وتشتەک، یان شێست وتشتەک پشكە، یا ژ هەمییێ باشتر گۆتنا (لا إله إلا الله)ە، ویا ژ هەمییێ نزمتر راكرنا نەخۆشییێیە ژ رێكێ، وشەرم پشكەكە ژ باوەریێ.

وئیسلام وئیمان ژ وان پەیڤانە یێن ئەگەر پێكڤە هاتنە گۆتن جودایی دێ د ناڤبەرا وان دا هەبت، وئەگەر هاتنە ژێكڤەكرن چو جودایی د ناڤبەرا وان دا نابت.

وپشتی دیاركرنا رامانا ئیسلامێ وئیمانێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رامانا (ئیحسانێ) ژی ئاشكەرا كر، وئەو مەرتەبەیەكا بلندترە ژ ئیمانێ، هندەک مرۆڤان باوەری یا هەی، بەلێ دەمێ ئێک شكێ بۆ وان د هندەک راستییێن باوەریێ دا چێ دكەت، شک بۆ وان چێ دبت، وئەڤە ئەون یێن نەگەهشتینە دەرەجەیا ئیحسانێ، چونكی ئیحسان ئەوە (**تو وەسا پەرستنا خودێ بكەی هەر وەكی تو وی دبینی؛ چونكی ئەگەر تو وی نەبینی ژی، ئەو تە دبینت**) وەكی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، وئەوێ نیاسینا وی بۆ خودێ وپەرستنا وی بۆ وی یا ب ڤی رەنگی بت، چو جاران ئەو د وی دا ناكەڤتە شكێ؛ چونكی مرۆڤ د وی تشتی دا ناكەڤتە شكێ یێ ب چاڤ ببینت.

وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا (ئحسانێ) دکەتە دو مەرتەبە:

یا بلندتر ئەوە مرۆڤ وەسا عیبادەتێ خودێ بکەت هەر وەکی مرۆڤ وی دبینت، یەعنی: د هەر حالەتەکێ خۆ دا ئەو یێ وەسا بت د هزرا وی دا یا حازر بت کو ئەو یێ نێزیکە ژ خودێ، ویێ د گەل وی، هەر وەکی ئەو یێ وی دبینت، وئەگەر ئەڤ چەندە ل بەر وی یا ب زەحمەت بت، بلا ئەو مەرتەبا دی یا نزمتر ل بیرا خۆ بینتەڤە، بلا ل بیرا خۆ بینتەڤە کو خودێ وی دبینت، ڤێجا شەرم ژێ بکەت، چونکی ئەگەر تە باوەری هەبت کو مەزنەک یێ تە دبینت، تو وی کاری ناکەی یێ وی پێ خۆش نەبت، چ ژ ترسان دا بت، چ ژ شەرمان دا بت! و ژ بەر ڤێ چەندێ زانایەک دبێژت: کانێ چەند خودێ دشێتە تە، هند تو ژ وی بترسە، وکانێ چەند ئەو یێ نێزیکی تەیە، هند تو شەرم ژ وی بکە!

وتشتێ دی یێ جبریلی پسیار ژێ کری ڕۆژا قیامەتێ بوو.. کانێ ئەو کەنگیە؟ وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا کر کو ئەوێ پسیار ژێ دئێتەکرن ڤێ مەسەلێ باشتر ژ وی نزانت یێ پسیارێ دکەت، مەعنا ئەو هەردو د نەزانینا ڤێ مەسەلێ دا وەکی ئێکن، وئەڤە ئیشارەتەکە ژ وی کو زانینا دەمێ هاتنا قیامەتێ ل نک خودێ ب تنێ هەیە، وەکی د ئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ (لقمان: ٣٤) هندی خودێیە زانینا دەمێ قیامەتێ ل نک وییە.. بەلێ هەر تشتەکی نیشان وعەلامەتێن خۆ هەنە، مرۆڤ وی یان هاتنا وی پێ دزانت، وقیامەتێ ژی مسۆگەر هندەک نیشانێن خۆ دێ هەبن، لەو جبریلی پسیارا نیشانان ژێ کر، پشتی بۆ وی ئاشکەرا بووی کو زانینا دەمێ هاتنا قیامەتێ ب خۆ د شیان دا نینە، و د بەرسڤێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو نیشان بۆ وی ئاشکەرا کرن:

نیشانا ئێکێ: (**کو ژنێ خاتوینا خۆ ببت**) و د شەرحا ڤێ گۆتنێ دا زانایان دو بۆچوون هەنە: هندەک دبێژن: مەخسەد ب خاتوینا ژنێ ئەوە کرین

وفرۆتنا جاریان دێ مشە بت، حەتا دێ وە لێ ئێت ژنا جاریە دێ شوی ب سەییدێ خۆ کەت، وعەیال ژێ بت، کورِ وکچ، وهنگی عەیالێ وێ دێ بنە سەییدێن وێ. وهندەک زانایێن دی دبێژن: مەخسەد ب ڤێ گۆتنێ ئەوە ل دویماهیا زەمانی حال وئەحوالێن خەلکی دەرنشیڤ دبن، وئەخلاق ورەحم نامینت، حەتا دێ وە لێ ئێت عەیالێ ژنێ هند دێ خراب بن حوکمی دێ لێ کەن، ووەسا دێ تەعامولێ د گەل کەن، وەکی خاتوین تەعامولێ د گەل خدامێ دکەت، وحەدیسێ ئیشارەت دا کچێ وگۆت: ژنێ خاتوینا خۆ دێ بت، وبەحسێ کورِی نەکر؛ چونکی (عقووقا کچێ د گەل دەیکێ) کرێتترە ژ یا کورِی، هەر چەندە هەردو دکرێت وحەرامن ژی. وزانایێ مەزن (ئبن حەجەر) ل باوەرێیە کو ئەڤ بۆچوونا دووێ دورستترە؛ چونکی ئەو هندێ دگەهینت کو ل دویماهیا زەمانی کاروبارێ خەلکی سەرک وبنک دبن، وئەو وەکی خۆ نامینن، لەو حال خراب دبت، وتشتێ ڤێ بۆچوونێ ب هێز دئێخت نیشانا دووێ ژی یە یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەحس ژێ دکەت، دەمێ دبێژت: (**وکو تو ببینی پێخواس ورِویس وهەژار، شڤانێن بزنان ئاڤاهیان بلند بکەن**) وئەڤە هندێ دگەهینت کو ل دویماهیا زەمانی دەمێ حال دئێتە گوهارِتن کەسێن نزم بلند دبن، وبێن بلند نزم دبن، خەلکێ بادیێ ژ هەژار ونەزان وشڤانان دئێنە بازێرِان، ومالەکێ بۆش دکەفتە دەستێ وان، حەتا ئەو مونافەسێ د ئاڤاکرن وبلندکرنا ئاڤاهیان دا دکەن، و د هندەک حەدیسێن دی دا هاتیە کو ئەو دبنە مەزنێن خەلکی ژی، وەکی د وێ حەدیسێ دا هاتی یا ئەحمەد ڤەدگوهێزت وتێدا هاتیی: ﴿ يُوشِكُ أَنْ يَغْلِبَ عَلَى الدُّنْيَا لُكَعُ بْنُ لُكَعٍ ﴾ یەعنی: نێزیکە دنیا بکەفتە دەستێن بێخێرێن کورِێن بێخێران. وچونکی ئەو نە ژ هەژی وی مەنصبینە یێ کەفتیە د دەستێن وان دا ئەو دبینە ئەگەرا خراببوونا حال وئەحوالان، وپێغەمبەر د گۆتنەکا خۆ یا دی دا دبێژت: ﴿ إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ ﴾ ئەگەر کار کەفتە د دەستێن مرۆڤێن نە ژ هەژی دا تو ل هیڤیا قیامەتێ بە!

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ژ تۆرەبێن مرۆڤێ زانایە کو ئەگەر پسیارا تشتەکی ژێ هاتەکرن ووی بەرسڤ نەزانی، بێژت: ئەز نزانم، وئەڤ چەندا هە چویێ ژ بهایێ وی کێم ناکەت، بەلکی ئەو دێ بتە نیشانا دینداری و(تەواضعا) وی.

٢- پسیارکرن ڕێکەکە ژ ڕێکێن خۆفێرکرنێ، و ب دەست ڤە ئینانا زانینێ، لەو پێتڤیە ئەڤ ئسلووبە نەئێتە ژ بیرکرن.

٣- وحەدیس هندێ دگەهینت کو یا باش ئەوە دەمێ مرۆڤ دچتە دیوانا کەسەکێ مەزن و ب قەدر خۆ پاقژ بکەت، ویێ ب سەروبەر بت.

٤- علمێ غەیبێ، ودەمێ هاتنا ڕۆژا قیامەتێ ژ وی علمیە، ژ خودێ پێڤەتر کەس نزانت، وخۆ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وجبریل ژی ڤی علمی نزانن، ڤێجا چاوا ئێکێ د بن وان دا دێ زانت.

٥- یا باش نینە موسلمان بێی هەوجەیی (مونافەسێ) د ئاڤاکرن وبلندکرنا ئاڤاهیان دا بکەن، و د حەدیسەکا دورست دا هاتیە: ﴿ **كل نفقة ينفقها العبد يؤجر فيها إلا البنيان** ﴾ هەر مالەکێ بەنی خەرج بکەت ئەو بۆ وی ب خێر دئێتە نڤیسین، ئەو نەبت یێ ئەو د ئاڤاهیان دا خەرج دکەت.

## حەدیسا سێیێ

**عن عَبْدِ الله بنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رَضِيَ الله عَنْهُما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ﴿ بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ ﴾.**

**رواه البخاري ومسلم**

ژ عەبدللاهێ کوڕێ عومەرێ کوڕێ خەططابی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- دگۆت: ئیسلام ل سەر پێنج تشتان هاتیە ئاڤاکرن: شاهدەدانا کو ژ خودێ پێڤەتر چو خودایێن ب حەق نینن، وکوموحەممەد عەبدێ وی وپێغەمبەرێ وییە، وکرنا نڤێژان، ودانا زەکاتێ، وحەجا بەیتێ، وگرتنا ڕۆژیێن رەمەزانێ.

بوخاری وموسلم ڤێ حەدیسێ ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە ژی هندێ دگەهینت کو ئیسلام ل سەر ڤان هەر پێنج ستوینان یا هاتیە ئاڤاکرن، وئەڤ هەر پێنج کارە بۆ ئیسلامێ وەکی وان شەنگستەیانە یێن ئاڤاهی خۆ ل سەر ڕادگرت، وکانێ چاوا ئاڤاهی بێی ستوین وشەنگستە خۆ ڕاناگرت، ودێ کەڤت، وەسا ئیسلام ژی بێی هەبوونا ڤان کاران نابت.

وكانێ چاوا سەرنگەستە ب تنێ نە هەمی ئاڤاهیە، وەسا ئەڤ کارە ژی ب تنێ نە هەمی ئیسلامە، وئەو کارێن دی یێن د هندەک ئایەت وحەدیسێن دی دا هاتین دبنە تمامکرن بۆ ئاڤاهییێ ئیسلامێ، وهەر جارەکا تشتەک ژێ کێم بوو، ئەو هندەک ژ ئاڤاهی کێم بوو، ڕاستە ئاڤاهی ناکەڤت وئێکجار خراب نابت و ب سەرێک دا نائێتە خوارێ، بەلێ ئاڤاهی ئاڤاهیەکێ تمام نابت، و ل بەر چاڤێن خەلکی جوان نائێتە دیتن.

ستوینا ئێکێ ژ ستوینێن ئیسلامێ -وەکی ژ حەدیسێ ئاشکەرا دبت- باوەری ئینانا ب خودێ وپێغەمبەریە، ئەوا ب شاهدەدانێ دئێتە ئاشکەراکرن، مەعنا: باوەری ئینانا ب خودێ وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ئەوا د حەدیسا بۆری دا ژ ئیمانێ هاتیە هژمارتن، دکەفتە د بن مەعنایا ئیسلامێ ژی ڤە، بەلکی ئەو ستوینەکە ژ ستوینێن ئیسلامێ.

وهەر چار ستوینێن دی، ئەو هەر چار عیبادەتێن مەزنن یێن ئیسلاما مرۆڤی پێ دئێتە نیاسین وبەرچاڤ کرن، بەلکی ئەو وەکی وی پەرژانینە یێ دکەفتە ناڤبەرا خودانی وکوفرێ دا، وەکی د حەدیسەکێ دا یا موسلم ڤەدگوهێزت هاتی: ﴿ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ ﴾ د ناڤبەرا زەلامی وشرکێ وکوفرێ دا هێلانا نڤێژێیە، یەعنی: هێلانا نڤێژێیە خودانی ژ لایێ ئیسلامێ ڤەدگوهێزتە لایێ کوفرێ وشرکێ.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئیسلامێ ل وێ باوەرێنە کو هەر کەسەکێ ڤان هەر پێنج ستوینێن ئیسلامێ بهێلت، ژ قەستا، وباوەریێ پێ نەئینت، ئەو دێ ژ کافران ئێتە هژمارتن، وئەڤ هەر پێنج ستوینە پێکڤە دگرێداینە، ونابت مرۆڤ باوەریێ ب هندەکان بینت و ب هندەکان نەئینت، یێ باوەریێ ب ئێکێ نەئینت، وەکی وی لێ دئێت یێ باوەریێ ب وان هەمیان نەئینت.

**مفاییێن حەدیسێ:**

١- حەدیس هندێ دگەهینت کو مرۆڤ نابتە موسلمان حەتا ئەو وان ستوینێن ئیسلامێ ب جهـ نەئینت یێن د ڤێ حەدیسێ دا هاتینە هژمارتن.

٢- وئەو هەر پێنج ستوین ژی ئەڤەنە: شاهدەدان، ونڤێژ، وزەکات، وحەج، ورۆژی.

# حەدیسا چارێ

عنْ عَبْد الله بن مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم، وَهُوَ الصَّادِقُ المَصْدُوقُ: ﴿ إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَة، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ المَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَوَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عەبدللاهێ کورێ مەسعوودی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن دبێژت: پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- وئەوە یێ ڕاستگۆ بۆ مە ئاخفت وگۆت: هندی ئێک ژ هەوەیە ئافراندنا وی د زکێ دەیکا وی دا چل ڕۆژان دئێتە کۆمکرن چپک، پاشی هندی وێ ئەو دبتە خوینەکا هشک، پاشی هندی وێ دبتە پارچەگۆشت، پاشی ملیاکەت بۆ دئێتە هنارتن، ورحێ پف دکەتێ، پاشی فەرمان ب چار پەیڤان لێ دئێتەکرن: ب نڤیسینا رزقێ وی، وئەجەلێ وی، وکارێ وی، وکانێ ئەو یێ بەختڕەشە یان یێ دلخۆشە، ڤێجا ئەز ب وی

خودایێ کەمە یێ چو خودایێن حەق ژ وی پێڤەتر نەهەین، هندی ئێک ژ هەوەیە دێ ب کارێ خەلکێ بەحەشتێ کەت حەتا د ناڤبەرا وی ووێ دا گەزەکا ب تنێ دمینت، دێ نڤیسین بەری وی ڕاکەت، ڤێجا ئەو دێ ب کارێ خەلکێ ئاگری کەت، ودێ چتە تێدا، وئێک ژ هەوە دێ ب کارێ خەلکێ ئاگری کەت حەتا د ناڤبەرا وی وئاگری دا گەزەکا ب تنێ دمینت، ڤێجا نڤیسین دێ بەری وی ڕاکەت، وئەو دێ ب کارێ خەلکێ بەحەشتێ کەت، ودێ چتە تێدا.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ڤێ حەدیسێ ژی گرنگیا خۆ هەیە؛ چونکی ئەو ئێک ژ وان حەدیسانە یێن بەحس ژ دو مەسەلێن مەزن دکەت:

- مەسەلا چاوانیا ئافراندنا مرۆڤی، بەری ئەو بێتە سەر دنیایێ، وئەڤە ئێک ژ وان مەسەلان بوو یێن ل دەمێ گۆتنا ڤێ حەدیسێ ژ مەسەلێن ڤەشارتی خۆ ل بەر زانایان دهاتە هژمارتن، لەو ئەو حسێب دبت ئێک ژ وان گۆتنێن موعجزە یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتین.

- ومەسەلا دووێ مەسەلا قەزا وقەدەرێیە، ئەوا دئێتە هژمارتن ئێک ژ ستوینێن باوەرییێ، وەکی د حەدیسا دووێ ژی دا هاتی.

وئەگەر بەرێ خۆ بدەینە حەدیسێ دێ بینین گەلەک فایدە ومفایێن مەزن تێدا هەنە، ژ وان وەکی مە گۆتی مەسەلا ئافراندنا مرۆڤیە د وێ قوناغێ دا یا ب عەرەبی دبێژنێ: (جەنین)، یەعنی: دەمێ هێشتا ئەو د زکێ دەیکێ دا. وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت کو هەر قوناغەک ژ ڤان هەر سێ قوناغان یێن مرۆڤ تێ دبۆرت، بەری رح بۆ بێتەدان چل ڕۆژان ڤەدکێشت، وپشتی بۆرینا (١٢٠) ڕۆژان ژ دورستبوونا بچویکی ژ نوی رح بۆ دئێتەدان، و ب رحێ ئەو دبتە مرۆڤەکێ زێندی، وئەڤە مەسەلەکە زانینا

نوی ژی پشتەڤانییێ لێ دکەت، وهەر ل وی دەمێ یێ ملیاکەت دئێت دا رحێ بدەتە زارۆکی، فەرمان ل وی دئێتەکرن، ژ لایێ خودێ ڤە، کو ئەو چار تشتان یێ پەیوەندی ب ڤی زارۆکی ڤە هەین بنڤیست: رزقێ وی د دنیاییێ دا، کانێ دێ چەند بت وییێ چاوا بت، وئەجەلا وی، کانێ ئەو کەنگی دێ مرت وئەڤ رحە یا نوکە بۆ دئێتەدان دێ ژێ ئێتە ستاندن، وکارێ وی، کانێ ئەو دێ چ کەت، وکانێ ئەو دێ ژ ژ وان بەختڕەشان بت یێن بەرێ وان بۆ ئاگری دئێتەدان، یان دێ ژ وان دلخۆشان بت یێن بەرێ وان بۆ بەحەشتێ دئێتەدان؟

مەعنا: بەری بوونا وی ئەڤ هەر چار تشتە ل سەر وی دئێنە نڤیسین، وکەسەک نامرت حەتا رزقێ خۆ وئەجەلا خۆ تمام نەکەت، وزانینا خودێ ب وێ دویماهییێ یا ئەو دێ گەهتێ هێشتا وی دەست ب ڕێکێ نەکری، چو کاری ل وی ناکەت، وهلبژارتنێ ژ مرۆڤی ناستینت؛ چونکی ئەو ب وێ زانینێ یێ زانا نینە، وگەلەک ئایەت وحەدیسێن دی هەنە هندێ دگەهینن کو مرۆڤی ئیرادە وحەزکرن وئازادیا هلبژارتنێ هەیە، وچو فایدێ وی ناکەت ئەو بێژت: مانێ ئەڤە بۆ من یا نڤیسیبوو، د حەدیسەکا دی دا یا بوخاری وموسلم ژ ئیمام عەلی ڤەدگوهێزن هاتیە، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ هەر نەفسەکا هاتیەدان خودێ جهێ وێ د بەحەشتێ یان جەهنەمێ دا نڤیسیە، ونڤیسیە کانێ ئەو دێ یا بەختڕەش بت یان دلخۆش بت ﴾ ئینا زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ڤێجا پا هەما ئەم خۆ بهێلینە ب هیڤیا نڤیسینا خۆ ڤە وکاری بهێلین؟ وی گۆت: ﴿ کاری بکەن، چونکی هەر بۆ وی تشتی یێ هاتیە چێکرن یێ ئەو ژ بەر هاتیە ئافراندن، ئەوێن دلخۆش بەرێ وان بۆ کارێ دلخۆشان دێ ئێتەدان، وئەوێن بەختڕەش بەرێ وان بۆ کارێ بەختڕەشان دێ ئێتەدان ﴾ پاشی وی ئەڤ ئایەتە خواند:
﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ۝١٠ ﴾.

مەعنا: ئەو كارێ مرۆڤ دكەت ئەوە دبتە ئەگەرا (سەعادەت وشەقائا) خودانی، وهەر ئێک بەرێ وی ژ لایێ خودێ ڤە بۆ وی كاری دئێتەدان، وئەو رێ ل بەر وی دئێتە خۆشكرن و ب ساناهیكرن یا ئەو بۆ هاتیەدان، وچونكی مرۆڤ نزانت كانێ ئەو بۆ چ هاتیەدان، دڤێت ئەو قەستا وی كاری بكەت یێ فەرمان پێ لێ هاتیەكرن، وخۆ ژ وی كاری بدەتە پاش یێ ئەو ژێ هاتیە پاشڤەبرن، و د گەل هندێ ژی هەردەم ئەو دوعایان بۆ خۆ ژ خودایێ خۆ بكەت كو ئەو وی ژ (ئەهلێ سەعادەتێ) حسێب بكەت.

وشەرتێ كاری دویماهییە، وئەوێ دلەكێ پاقژ هەبت، وهەر ژ دەسپێكێ دورست بچتە رێكێ، وخۆ خەلەت نەكەت، وبارێ خۆ ژ گونەهان گران نەكەت، دویماهیا وی دێ ل سەر باشیێ بت، وئەوێ دلەكێ پیس وعەقیدەیەكا خراب هەبت، ئەگەر وی كارەكێ باش -ل بەر چاڤ هەبت- ژی دویماهیا وی دێ ل سەر خرابیێ راوەستت، د حەدیسەكا دی دا یا بوخاری ژ سەهلێ كورێ سەعدێ ساعدی ڤەدگوهێزت، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن ڤێ مەعنایێ پتر بۆ مە روهن دكەت دەمێ دبێژت: ﴿ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ ﴾ زەلامەک دێ كارەكی ژ كارێن خەلكێ بەحەشتێ كەت، وەكی ل پێش چاڤێن خەلكی دیار، وئەو ب خۆ ژ خەلكێ ئاگریە، وزەلامەک دێ كارەكی ژ كارێن خەلكێ ئاگری كەت وەكی ل پێش چاڤێن خەلكی دیار، وئەو ب خۆ ژ خەلكێ بەحەشتێیە.

یەعنی: بەلكی مرۆڤەک هەبت، ل پێش چاڤێن خەلكی كارەكێ باش ژ كارێن بەحەشتیان دكەت، حەتا خەلک هەمی دێ هزركەن ئەو بەحەشتیە، بەلێ ئنیەتا دلێ وی -یا خەلک پێ نەحەسییێن- یا خرابە، یان عەقیدەیا وی ب خودێ یا دورست نینە، لەو دویماهیێ (بەری مرنێ) ئەو دێ كارەكێ وەسا كەت یان گۆتنەكا وەسا بێژت ئەو كارێ وی كری هەمی پویچ ببت، وئەو بچتە جەهنەمێ، وەكی وی زەلامی (یێ ئەڤ حەدیسا بۆری ژ بەر وی

هاتیه گۆتن) دەمێ جیهادەكا مەزن كری، حەتا خەلكی گۆتی: كەسەك ژ مە ئەڤرۆ ئەو نەكریە یا ڤی مرۆڤی كری، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ژ بەر كو خودێ ئەو ب وێ غەیبێ ئاگەهدار كر یا صەحابیان نەدزانی ژ حالێ ڤی زەلامی، گۆت: ﴿ ئەو ژ خەلكێ ئاگریە ﴾ صەحابیان ئەڤ چەندە ب غەریبی ڤە وەرگرت، چاوا ئەو دێ خەلكێ ئاگری بت وئەو یێ ڤێ جیهادا هندە یا مەزن دكەت! پشتی دەمەكی صەحابیان دیت ئەو زەلام بریندار بوو، پاشی وی تەحەمولا برینا خۆ نەكر، شیرێ خۆ د سنگێ خۆ چكلاند وخۆ كوشت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە گۆت یا مە ڤەگێڕای.

ومرۆڤەكی دێ بینی، چونكی خەسلەتەكا خێرێ د دلێ وی دا هەیە، گەلەكێ ژ عەمرێ خۆ دێ د خرابیێ دا بۆڕینت، پاشی تە هند دیت وێ خەسلەتا خێرێ غەلەبەت ل وی كر، وبەرێ وی دا دویماهیا باش. وهەر چاوا بت دویماهی پتر جاران بەرهەمێ بەراهیێیە، ڤێجا بلا هەر كەسەك یێ ل خۆ هشیار بت.

وهندی پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ئەڤ دوعایە دكر: ﴿ يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك ﴾ ئەی وەرگێڕێ دلان، تو دلێ من ل سەر دینێ خۆ موكم بكە، جارەكێ دەیكا موسلمانان (أم سلمه)یێ گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تو چەند ڤێ دوعایێ دكەی؟! وی گۆت: ﴿ يا أم سلمة، إنه ليس آدمي إلا وقلبه بين أصبعين من أصابع الله فمن شاء أقام ومن شاء أزاغ ﴾ ئەی (أم سلمه) مرۆڤەك نینە ئەگەر دلێ وی د ناڤبەرا دو تبلان دا نەبت ژ تبلێن خودێ، یێ وی بڤێت ئەو دێ ڕاست كەت، ویێ وی بڤێت ئەو دێ د سەر ڕێكێ دا بەت. وەكی ئیمامێ ترمذی ڤەدگوهێزت، و د ریوایەتەكا دی هاتیە: صەحابیان گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مە باوەری ب تە و ب وی تشتی ژی ئینایە یێ تو پێ هاتی، ڤێجا ما تو ژ تشتەكی ژ مە دترسی، وی گۆت: ﴿ نعم، إن القلوب بين إصبعين من أصابع

الله يقلبها كما يشاء ﴾ بەلێ، هندی دلن ئەو د ناڤبەرا دو تبلان ژ تبلێن خودێ دانە، چاوا وی دڤێت ئەو وەسا وان وەردگێڕت.

یا رەببی، تو دلێن مە ل سەر حەقیێ موکم بکەی.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- حەدیس هندێ دگەهینت کو پێتڤیە مرۆڤ شوکرا وی خودایی بکەت یێ ئەو ژ لاوازیێ دای، و ب ڤی رەنگێ خوشکۆک ئافراندی، ورزقێ وی ژێ دای.

٢- رزق وئەجەل وکار ودویماهی ژ وێ غەیبێنە یا ژ خودێ پێڤەتر کەس نەزانت، وبەری مرۆڤ ببت ئەو یێن هاتینە نڤیسین، لەو دڤێت مرۆڤ خۆ ژێ نەترسینت، وگەلەک ژێ ب خەم نەکەڤت، بەلێ مەعنایا ڤێ ئەو نینە مرۆڤ روینتە خوارێ وئەگەران ب کار نەئینت.

٣- کار دبنە ئەگەرا چوونا مرۆڤی بۆ بەحەشتێ یان جەهنەمێ، هەر چەندە ئەو رەحما خودێ ژێ نەگرت ناچتە بەحەشتێ.

٤- شەرتێ کاری دویماهیە، ومرۆڤ ل سەر چ تشتی دمرت، ل سەر وی رادبت، وپێتڤیە غورور بۆ کەسێ ب کارێ وی چێ نەبت، چونکی ئەو نزانت کانێ دویماهیا وی دێ ل سەر چ راوەستت.

٥- حەتا بچویک نەبتە چار هەیڤی رح بۆ وی نائێتەدان، یەعنی: ئەو حسێب نابت مرۆڤ، لەو هندەک زانایان روخصەتا دایە دەیکێ ئەو بچویکی ژ بەر خۆ ببەت هندی ژیێ وی نەگەهشتبتە چار هەیڤیێ، بەلێ ئەڤ بۆچوونە یا دورست نینە، وبچویک ئەگەر پشتی چار هەیڤیێ ودانا رحێ ژ بەر دەیکێ بچت، هندەک زانا وەکی ئیمام ئەحمەدی دبێژن: دورستە نڤێژ ل سەر بێتەکرن.

## حەدیسا پێنجێ

عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَت: قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم: ﴿ مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ ﴾.

رواه البخاري ومسلم، وفي رواية لمسلم: ﴿ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ ﴾.

ژ عائیشایێ -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەچیێ تشتەکێ نوی د ڤی دینێ مە دا بینتە دەر وئەو نە ژ وی بت، ئەو دێ ئێتە زڤڕاندن.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن، و د ریوایەتەکێ دا ل نک موسلمی هاتیە: هەچیێ کارەکی بکەت دینێ مە ل سەر نەبت، ئەو دێ ئێتە زڤڕاندن.

بەری نوکە و د حەدیسا ئێکێ دا د گەل مە بۆری بوو کو تەرازیا ڤەشارتی یا قەبویلکرنا هەر کارەکی د ئیسلامێ دا (ئنیەتە)، ئەوێ ئنیەتا دلێ وی یا دورست نەبت هەر کارەکێ ئەو بکەت، دا خۆ پێ نێزیکی خودێ بکەت ژێ نائێتە قەبویلکرن، وئەڤ حەدیسە تەرازیەکا دی یا ئاشکەرا بۆ قەبویلکرنا کاری دیار دکەت، ئەو ژی ئەڤەیە هەر کارەکێ مرۆڤ بکەت دڤێت یێ رێککەفتی بت د گەل وێ رێ یا کیتاب وسوننەت پێ هاتین، مەعنا: هەر کارەکێ مرۆڤ بکەت، ئەگەر خۆ کارەکێ باش ژی بت، ئەگەر ئارمانج پێ کنارێ خودێ نەبت، ویێ وەسا نەبت وەکی خودێ وپێغەمبەری -سلاڤ

لێ بن- گۆتی، ئەو کار ژ خودانی نائێتە قەبویلکرن، ودێ لێ ئێتە زڤڕاندن، نەبەس هندە.. بەلکی ئەو دێ یێ گونەهکار ژی بت، وکارێ وی کری ژ دینی حسێب نابت، و د تەرازیا دینی دا نائێتە هژمارتن ژ کارێن باش، ئەگەر خۆ خەلک هزر بکەن ئەو کارەکێ باشە ژی.

وکانێ چاوا ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو هەر کارەکێ خەلک ژ نوی ژ نک خۆ دەربێخن، وبێژن: ئەڤە ژ دینیە وکارەکێ باشە، ئەو ژ دینی نابت، وکارەکێ باش ژی نابت، وەسا ئەو هندێ ژی دگەهینت کو هەر کارەکێ دین پێ هات بت، و د کیتابێ وسوننەتێ دا بت، ئەو کارەکێ باشە، ودێ یێ قەبویلکری بت.

وئەڤ حەدیسە، وەکی زانا دبێژن، دئێتە هژمارتن ئێک ژ وان حەدیسێن گرنگ، یێن کو پێتڤیە مرۆڤێ موسلمان بزانت و ب دورستی تێ بگەهت، ئیمامێ نەوەوی دبێت: ((ئەڤ حەدیسە پێتڤیە بێتە ژبەرکرن، و ب کارئینان د بەطاکرنا کارێن خراب دا))، وئبن حەجەر دبێژت: ((ئەڤ حەدیسە دئێتە هژمارتن ئێک ژ بناخەیێن ئیسلامێ، وپێپکێن دینی)).

وحەدیس یا ئاشکەرایە کو دینێ مە یێ تمامە، وچو یێ ژێ کێم نینە، وەکی خودایێ مەزن د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ (المائدة: ٣) یەعنی: ئەڤرۆ من دینێ هەوە بۆ هەوە پێک ئینا، ونعمەتا خۆ ل سەر هەوە تمامکر، وئەزرازی بووم ئیسلام بۆ هەوە ببتە دین. وتشت ئەگەر تمام بوو وپێکهات وی هەوجەیی ب کەسەکێ نابت پشتی هنگی بێت وبێژت: ئەز دێ وی تمام کەم، یان تشتەکی لێ زێدە کەم، ئەو کەسێ بێت و ژ نوی تشتەکی ژ نک خۆ دەربێخت، یێ نە خودێ گۆتی ونە پێغەمبەری، ونە صەحابیان کری، وبێژت: ئەڤە ژ دینیە وتشتەکێ باشە، هەر وەکی ئەو یێ دبێژت: هندەک دین یێ مای پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەگۆتی، وصەحابیان نەزانی، یان زانی و ژ قەستا بۆ مە نەگۆتی، ژ نوی ئەز دێ وی بێژم!!

وبێ عەقلی ونەزانین وبێ ئەدەبی ژ ڤێ مەزنتر نینە!!

ل سەر ڤی بناخەیی ئەم دشێین بێژین:

د مەسەلا عیبادەتی دا ئەصل د هەر تشتەکی دا حەرامیە، یەعنی: هەر عیبادەتەکێ مرۆڤ خۆ پێ نێزیکی خودێ بکەت، یێ حەرامە، ئەو تێ نەبت یێ قورئان وسوننەت پێ هاتی، وئەو عیبادەتێن قورئان وسوننەت پێ هاتین ژی دڤێت د وی جهی دا بێنە ب کارئینان یێ وان گۆتی، بێی تشتەک لێ بێتە زێدەکرن، بۆ نموونە: پەرستنا خودێ ب رەقاصێ، وەکی ل نک هندەک صووفیان هەی، نە خودێ گۆتیە ونە پێغەمبەری، لەو ئەو بیدعەیە ونائێتە قەبویلکرن، وخواندنا قورئانێ خێرەکا مەزنە، بەلێ خواندنا وێ د سوجوودێ دا چێ نابت، چونکی ئەو نە جهێ خواندنێیە، وکرنا نڤێژێ فەرزە بەلێ زێدەکرنا رکاعەتەکێ ل نڤێژێ دبتە ئەگەرا بەطالبوونا نڤێژێ.

و د مەسەلا موعامەلاتان دا ئەصل د هەر تشتەکی دا حەلالیە، ئەو کار تێ نەبت یێ قورئان وسوننەت پێ هاتین، وەکی وان عەقدێن حەرام، وەکی ریبایێ، یان غشـشێ، یان فرۆتنا تشتێ حەرام.. وهەر کەسەکێ بێت وعەقدەکا شریعەتی دورست کری ئەو مەنعە کەت، یان شریعەتی حەرام کری ئەو دورست بکەت، کارێ وی ژێ نائێتە قەبویلکرن، ودئێتە حسێبکرن بیدعە د دینی دا.

و ل ڤێرێ دڤێت بیرا طەلەبێن علمی بینینە ڤە کو ئەو لەزێ ددانا حوکمی دا ل سەر کاران نەکەن، ونە هەر تشتەکێ وان نەدیت بت ، یان علمێ وان پێ نەبت، ئەو ئێکسەر بێژن: ئەڤە بیدعەیە، وڤێ حەدیسێ بۆ خۆ بکەنە دەلیل؛ چونکی دانا حوکمی ب بیدعێ ل سەر تشتی کارەکێ مەزنە ویێ ب ساناهی نینە، دڤێت ئەو ل ئاخفتنێن زانایان بزڤرن، وئەصل وبناخەیێن مەسەلێ بزانن، پاشی حوکمی بدەن، ئەگەر مەسەلێ موحتاجی ب حوکمێ وان هەبت، ئەگەر نە.. هەما یا ب سلامەتی بۆ وان ئەوە ئەو هەر چو حوکمان نەدەن!

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو دینێ مە یێ تمامە، وچو کێماسی تێدا نینن، وهەوجە ناکەت کەسەک بێت و ژ نوی وی تمام بکەت.

٢- هەر کارەکێ نوی د دینی دا دەرکەڤت، بیدعەیە، ژ خودانی نائێتە قەبویلکرن، ولێ دئێتە زڤڕاندن، ئەو کەسێ وی کاری دکەت کی بت.

٣- دەمێ حەدیس دبێژت: ئەو کار یێ زڤڕاندیە.. مەعنا: ئەو کار یێ فاسدە، چو نائێتە شوینێ، ژبلی گونەهێ وشەرمزارییێ!

## حەدیسا شەشێ

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: ﴿ إِنَّ الحَلاَلَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أمور مُشْتَبِهَاتٌ، لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ نوعمانێ کورێ بەشیری -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوو دگۆت: هندی حەلالە یێ ئاشکەرایە، وهندی حەرامە یێ ئاشکەرایە، و د ناڤبەرا هەردووان دا هندەک کارێن نەئاشکەرا هەنە، گەلەک کەس وان نزانن، ڤێجا هەچییێ خۆ ژ کارێن نەئاشکەرا بپارێزت ئەو وی دینێ خۆ وناموسا خۆ پاراست، وهەچییێ بکەفتە د ناڤ وان دا ئەو کەفتە حەرامییێ، وەکی وی شڤانی یێ پەزێ خۆ ل دۆر پاوانی دچەرینت، نێزیکە بچتە ناڤ وبچەرینت، وهەر مەلکەکی پاوانەک هەیە، وپاوانێ خودێ ئەو تشتن یێن وی حەرام کرین، و د لەشی دا پارچەیەک هەیە ئەگەر ئەو چاک بوو لەش هەمی دێ چاک بت، وئەگەر ئەو خراب بوو لەش هەمی دێ خراب بت، وئەو پارچە دلە.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە ژی ئێک ژ حەدیسێن مەزنە، یێن دبنە پێپکەکێ موکم بۆ ئاڤاهیێ شریعەتی، زانایێ حەدیسێ یێ ناڤدار (ئەبوو داوود) دبێژت: ئیسلام ل دۆر چار حەدیسان دزڤرت.. ئێک ژ وان حەدیسان ئەڤ حەدیسە.

وئەڤ حەدیسە بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو تشتێ خوری حەلال بت یێ ئاشکەرایە، وتشتێ خوری حەرام ژی بت یێ ئاشکەرایە، یەعنی: دەلیلێن حەلالی وحەرامیا وان دئاشکەرانە، ومرۆڤ ب عەقلێ خۆ دگەهتێ، ودزانت ئەڤ تشتە یێ حەلالە یان نە.. گەلەک مەسەلە هەنە هەر مرۆڤەکێ پسیارێ ژ خۆ بکەت وهزرا خۆ تێدا بکەت دێ زانت کانێ ئەو دحەلالن یان نە، بێی کەسەک بۆ بێژت، ئەڤ کارێن ب ڤی ڕەنگی بن، کەسەکێ د ناڤ موسلمانان دا بژیت چو عوزر وهێجەت نابن نەزانت، یان کاری پێ نەکەت.

بەلێ د ناڤبەرا هەردووان دا هندەک تشت هەنە مرۆڤێن زانا ب دینی ب تنێ دزانن، چونکی ژ لایەکی ڤە ئەگەر مرۆڤ بەرێ خۆ بدەتێ دێ بینت ئەو وەکی حەلالینە، و ژ لایەکێ دی ڤە هندەک تشت د ناڤ دا هەنە مرۆڤی تێدا دئێخنە شکێ حەتا دێ هزر کەت ئەو تشتەکێ حەرامە، ئەڤ کارە ئەون یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ: (مُشْتَبِهَات) دانایە سەر، یەعنی: ئەو کارێن حەلالی وحەرامیا وان نە یا ئاشکەرا، ودەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: گەلەک مرۆڤ وان نزانن، ژێ دئێتە زانین کو د ناڤ مرۆڤان دا هندەک هەنە دزانن، وئەو مرۆڤ ئەون یێن زانا ب شریعەتی، مەعنا: ئەو کار ل بەر زانایان نە ژ (مُشْتَبِهَات)انە، لەو هەر جارەکا مەسەلە ل بەر مرۆڤی ئالۆز بوو، ووی نەزانی کانێ ئەو ژ حەلالیە یان ژ حەرامیە، دڤێت بەری ئەو وی کاری بکەت، پسیارا مرۆڤەکێ زانا بکەت، وئەگەر هات ووی چو زانا نەدیتن پسیارا خۆ ژێ بکەت، یان ئەو زانایێن هەین نە ل وی مستەوایی بن بەرسڤا وی ب دورستی بدەن، هنگی یا باش بۆ وی ئەوە ئەو خۆ ژ وی تشتی بدەتە پاش ونەکەت. وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنا خۆ دا بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو مرۆڤ د ڤان مەسەلان دا دو ڕەنگن:

- هندەک ژ تەقوایێ و ژ بەر ترسا خودێ، خۆ ژ ڤان کاران ددەنە پاش، دا تووشی حەرامیێ نەبن، ئەڤە دینێ خۆ وناموسا خۆ دپارێزن، دینێ خۆ چونکی ئەو ژ حەرامیێ دویر دکەڤن، وناموسا خۆ چونکی خۆ ژ ئەزمانێ خەلکی وئاخفتنێن وان دپارێزن.

- وهندەک هەنە خۆ ژ وی کاری نادەنە پاش یێ (موتەشابەهـ) وئەڤە ئێک ژ دووانە: یان چونکی ئەو کار ل نک وی نە ژ (موتەشابهانە)، بەلکی ژ کارێن حەلالە، لەو ئەو خۆ ژێ نادەتە پاش، وهەر چەندە ئەڤە تووشی حەرامی نابت ژی، بەلێ یا باشتر ئەوە ئەو وی کاری نەکەت، دا ناموسا وی پاراستی بمینت، یەعنی: خەلک بەحسێ وی نەکەت. یان ژی ئەو کار ل نک وی ژ (موتەشابهانە) بەلێ چونکی ئەو بۆ وی یێ خۆشە، و ل دویڤ دلێ ویە ئەو خۆ ژێ نادەتە پاش، وئەڤە ئەوە یێ تووشی حەرامی دبت.

وپشتی دیارکرنا ڤێ مەسەلێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەتەلەک بۆ مە ئینای دا ڤێ مەسەلێ پتر ل بەر روهن بکەت، وگۆت: هەر مەلکەکی یان مەزنەکی ژ مەزنێن دنیایێ جهەکێ هەی بۆ خۆ ب تنێ پاوان دکەت، وناهێلت کەسەک ژ بلی وی وێێن وی بڤێن بچتێ، وخودێ ژی د دنیایێ دا پاوانەکێ هەی وی عەبدێن خۆ یێن مەنعەکرین نێزیک ببن، ئەو پاوان تشتێن حەرامن، یەعنی: وی حەرامی یێ تەعان کری، وفەرمان یا ل عەبدێن خۆ کری کو کەس ژ وان خۆ نێزیک نەکەت، ڤێجا هەچییێ پەزێ خۆ ببەت ب رەخ پاوانێ مەلکی ڤە بچەرینت، ئەو نزانت بەلکی دەمەکی ژێ غافل ببت وهند ببینت پەزێ وی یێ ب ناڤ پاوانی ڤە چووی وزیانا کری، وهنگی ئەو دێ خۆ تووشی غەزەبا مەلکی کەت، بەلێ ئەگەر وی پەزێ خۆ بر ژ پاوانی دویر کر، دێ پشت راست کو پەزێ وی زیانەکێ بکەت.. و ژ ڤێ مەتەلێ ئاشکەرا دبت کو پێتڤیە مرۆڤ خۆ ژ کارێن حەرام بدەتە پاش، وپەرژانەکی بێختە د ناڤبەرا خۆ وحەرامی دا؛ دا کو ژ غەزەبا خودێ بێتە پاراستن، وتەقوا ل نک پەیدا ببت.

وئەڤ حەدیسە بۆ وان دبتە دەلیل ئەوێن دبێژن: ئەو کارێن مرۆڤی بەر ب حەرامی ڤە دبەن، وسەری دکێشنە حەرامی، دحەرامن، ئەگەر خۆ د نەفسا خۆ دا دحەلال ژی بن، وەکی مانا زەلامەکی د گەل ژنەکێ ل جهەکی ب تنێ، یان (نەظەر) وبەرێخۆدانا تشتێ حەرام.

و ل دویماهیا گۆتنا خۆ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مە ل گرنگیا دلی بۆ لەشی ئاگەهدار دکەت، ودبێژت: هەر جارەکا دل دورست بوو لەش هەمی دێ دورست بت، و ژ ڤێ گۆتنێ درەوا وان کەسان دیار دبت ئەوێن ب لەشێ خۆ کارێن خراب دکەن، ودبێژن: دلێ مە یێ پاقژە! دل ئەگەر پاقژ بوو، لەش ژی دێ پاقژ بت، وپیسیا کارێ خودانی نیشانا نەپاقژیا دلێ ویە. یەحیایێ کورێ موعاذی دبێژت: ئەو کەس یێ ڕاستگۆ نینە ئەوێ بێژت ئەز حەز ژ خودێ دکەم، وتوخویبێن وی ناپارێزت. ودل ئەگەر پیس بوو وخودانی بەرگەریان نەکر وی ب تۆبێ بشۆت وپاقژ بکەت، خودێ وێ پیسیێ -ئەگەر چ یا ڤەشارتیە ژی- بۆ خەلکی هەر دێ بەرچاڤ کەت، وەکی د ئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ﴾ (محمد: ٢٩) یەعنی: ئەرێ ما ئەو دورییێن کەرب وکین د دلێن وان دا هەی هزر کریە خودێ وێ دەرنائێخت وبۆ خەلکی بەرچاڤ ناکەت؟ بەلێ.. هندی خودێیە مرۆڤێ ڕاستگۆ ویێ درەوین هەر دێ ژێک جودا کەت!

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو پێتڤیە مرۆڤێ موسلمان خۆ ژ وان کاران بدەتە پاش یێن خودێ حەرام کرین، و د ناڤبەرا خۆ ووان دا پەرژانەکی بدانت.

٢- ژ تەقواییێیە مرۆڤ خۆ ژ وی تشتی بدەتە پاش یێ گومان تێدا بت، وحەلالی وحەرامیا وی یا ئاشکەرا نەبت، وپاراستنا دین وناموسێ ژی د ڤێ چەندێ دا هەیە.

٣- وئەڤ حەدیسە دەلیلە کو تشتێ سەری بکێشتە حەرامی حەرامە، ئەگەر ئەوب خۆ یێ حەلال ژی بت، ل دویڤ قاعیدەیێ (سد الذرائع) یێ زانایا بنەجهکری.

٤- ژ حەدیسێ دئێتە وەرگرتن کو ئەگەر شڤانەکی پەزێ خۆ برە ب ڕەخ پاوانێ کەسەکی ڤە وچەراند، وپەز چو ناڤ زیانێ، هەر زیانەکا پەزێ وی بگەهینتە وی پاوانی، خەرامەت ل سەر شڤانیە، وفایدێ وی ناکەت بێژت: من های ژێ نەبوو، یان مەخسەدا من ئەو نەبوو! وەکی وی یێ ل دۆر گونەهێ دزڤرت، ئەگەر ئەو ب ناڤ ڤە چوو دێ خۆ هێژای عقووبێ کەت، وچو هێجەت ژێ نائێنە قەبویلکرن.

٥- گرنگیا دلی وپاقژیا وی ژی ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە زانین، وکو پێتڤیە ل سەر مرۆڤێ موسلمان گەلەک خەمێ ژ پاقژکرنا دلێ خۆ بخۆت، چونکی ب پاقژیا دلی کارێ لەشی هەمی پاقژ دبت، و ب پیسیا دلی کارێ لەشی هەمی پیس دبت.

# حەدیسا حەفتێ

عَنْ أبـي رقـيـة تَميم بن أوس الدَّارِيِّ -رضي الله عنه- أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: ﴿ الدِّينُ النَّصِيحَةُ ﴾ قُـلْـنَـا: لِـمَـنْ؟ قَالَ: ﴿ لله، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَعَامَّتِهِمْ ﴾.

رواه مسلم

ژ تەمیمێ کورێ ئەوسێ داری -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: دین شیرەتە، ئینا مە گۆت: بۆ کێ؟ وی گۆت: بۆ خودێ، وبۆ کیتابا وی، وبۆ پێغەمبەرێ وی، وبۆ مەزنێن موسلمانان، وعامییێن وان.

موسلم ڤەدگوهێزت

گرنگیا ڤێ حەدیسێ ژ هندێ دئێت ئەو رادگەهینت کو ستوینا گرنگا دین خۆ ل سەر دگرت شیرەتە، وهندی ئەو مابت دین د ناڤ خەلکی دا دێ هەبت، وهەر جارەکا ئەو نەما کێماسی دێ کەفتە هەمی لایێن ژینا موسلمانان.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا ئاشکەرا دکەت کو هەما دین شیرەتە، و د هندەک ریوایەتان دا هاتیە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە سێ جاران دوبارە کر، ودوبارەکرنا وێ سێ جاران پتر گرنگیا وێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، لەو ژ ئەبوو داوودی دئێتە ڤەگوهاستن کو ئەڤە ئێک ژ وان حەدیسانە یێن فقهـ ل دۆر دزڤڕت.

ویەیڤا (نەصیحەت) د زمانێ عەرەبان دا ب ڕامانا صەفاندنێ دئێت، وەکی هنگڤینی دەمێ شەما ژ ناڤ دئێتە ڕاکرن، و د زاراڤێ شەرعی دا ئەو بۆ هندێ دئێتە ب کارئینان دەمێ مرۆڤی خێر بۆ وی بڤێت یێ مرۆڤ نصیحەتی لێ دکەت، گاڤا تە خێر بۆ ئێکی ڤیا، وتە دیت ئەو وی کاری ناکەت یێ تو هزر دکەی خێرا وی یا تێدا، ڤێجا تو بەرێ وی بدەیە وێ خێرێ، وداخوازێ ژێ بکەی ئەو وێ بکەت، ئەو تە ئەو نصیحەت کر. وددەمێ ئەم دبێژین: نصیحەت صەفاندنە، یان صافیکرنە، بۆ مە ئاشکەرا دبت کو نصیحەت ژ ڤی لایی ڤە ڕامانا ڕاستگۆیی وئیخلاصێ ددەت، وئەڤە هندەک ژ مەعنا بەرسڤا پێغەمبەریە -سلاڤ لێ بن- ل سەر پسیارا صەحابیان دەمێ وان گۆتیێ: نصیحەت بۆ کێیە؟ وی گۆت: بۆ خودێ وبۆ کیتابا وی وبۆ پێغەمبەرێ وی..

نصیحەتا بۆ خودێ یا چاوایە؟

وەسایە مرۆڤ د عیبادەتێ خۆ دا بۆ وی یێ ڕاستگۆ ومخلص بت، باوەریێ پێ بینت، وگوهداریا وی بکەت، د تەفسیرا وێ ئایەتێ دا یا تێدا هاتی: ﴿ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ ﴾ (التوبة: ٩١) ئیمامێ قورطوبی دبێژت: ((زانا دبێژن: نصیحەتێ بۆ خودێ ئەوە مرۆڤی ئیخلاص د باوەری ئینانا ب تەوحیدا وی دا هەبت، وسالۆخدانا وی ب سالۆخەتێن ئولوهییەتێ، ووی پاک بکەت ژ کێماسیان، وحەز بکەت خۆ نێزیکی وان تشتان بکەت یێن ئەو حەز ژێ دکەت، وخۆ ژ وان تشتان بدەتە پاش یێن وی نەڤێن)).

ونصیحەتێ بۆ کیتابا وی ئەوە مرۆڤ باوەریێ پێ بینت، وحەز ژێ بکەت، وخۆ تێ بگەهینت، وکاری پێ بکەت، وبەرێ خەلکی ژی بدەتە وێ ڕێکێ یێ قورئان پێ هاتی.

ونصیحەتێ بۆ پێغەمبەرێ وی ئەوە باوەریێ پێ بینت، وگوهداریا وی بکەت، و ب چاڤێ ڕێز وئحترامێ بەرێ خۆ بدەتە وی، وسوننەتا وی، وحەز ژ بنەمال وصەحابیێن وی بکەت، وکاری ب دینێ وی بکەت.

ونـصيحەت بـۆ مـەزنـێن موسـلمانان ئـەوە مـرۆڤ هاریکاریـا وان ل سـەر قـەنجیـێ بکـەت، وبـەرەڤـانییێ ژێ بکـەت، ونـەیـارەتیـا وان نـەکـەت، ودلـێن خەلکی ژ وان سار نەکەت، وخێرا وان بڤێت، وئـەگـەر کێماسـیەک ژێ دیـت وان ئاگەهدار بکەت.

ونصیحەت بۆ عامییێن موسلمانان ئـەوە مـرۆڤ دینـێ دورست نیـشا وان بدەت، وبەرەڤانییێ ژێ بکەت، و د خێرا وان دا بت، و ب گۆتن وکریارێن خۆ حیلێ وغشێ ل وان نەکەت، وئەگەر خـەلـەتیـەک یـان کێماسیەک ژ وان دیت ب رەنگەکێ جوان وان شیرەت بکەت، وبەرێ وان بدەتە رێکا دورست.

وشیرەتکرنکارێ پێغەمبـەر وچاکـان بـوو، وئـەو (فـرض کفایـە)یـە ل سـەر ئوممەتێ، ومـرۆڤـێ ب کـارێ شیرەتکرنێ رابیت دڤێت ئەخلاقـێ پێغـەمبـەران ل نک هەبت، بزانت چاوا دێ شیرەتـان ل خـەلکی کـەت، فوضـەیلێ کورێ عیاضی دبێژت: خودان باوەر تشتی ستارە دکەت وشیرەتـان دکـەت، ومرۆڤـێ فاجر هەتکا خەلکی دبەت وطـانا ددانتە خەلکی.. یەعنی: دڤێت مـرۆڤ یـێ هشیار بت ب هێجەتا شیرەت ونصیحەتان هەتکا خـەلکی نـەبـەت، وشـەرمـا وان د ناڤ خەلکی دا ببەت، ئەڤە نە ژ ئەخلاقێ خودان باوەرانە.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- دین شیرەتە، وکارێ شیرەتکرنێ ژ باوەرییێیە، ووی گرنگیا خۆ هەیە.

٢- چـونکی شـیرەتکـرن دینـە، هنـدەک ژ دینـی هـەیـە فـەرضـە، وهنـدەک واجبە، وهندەک سوننەتە، مەعنا شیرەت هندەک جاران دبتـە فـەرض وهنـدەک جاران دبتە واجب، وهندەک جاران دبتە سوننەت.

٣- ئەو کەسێ ب کارێ شیرەتکرنێ رادبت دڤێت ئەخلاقەکێ باش ل نک هـەبـت، و ب هێـجـەتـا نـصیحەتی کەسێ بەرانبەر نـەشـکێنت، وهـەتکـا وی د ناڤ خەلکی دا نەبەت.

## حەدیسا هەشتێ

عَنْ ابْنِ عُمَرَ -رضي الله عنـه- أَنَّ رَسُـولَ الله -صـلى الله عليـه وسلم- قَالَ: ﴿ أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّـى يَـشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا الله، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله، وَيُقِيمُـوا الـصَّلَاةَ، وَيُؤْتُـوا الزَّكَـاةَ، فَـإِذَا فَعَلُـوا ذَلِـكَ عَـصَمُوا مِنِّـي دِمَـاءَهُمْ وَأَمْـوَالَهُمْ إِلَّا بِحَـقِّ الْإِسْـلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى الله تعالى ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عەبدللاهێ کورێ عومەری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: فەرمان ل من هاتەکرن ئەز شەرێ خەلکی بکەم حەتا ئەو شاهدە بدەن کو ژ خودێ پێڤەتر چو خودایێن ب حەق نینن وکو موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە، ونڤێژان بکەن، وزەکاتێ بدەن، ڤێجا ئەگەر وان وە کر ئەو خوینا خۆ ومالێ خۆ دێ ژ من پارێزن، وەسا نەبت ب حەقێ ئیسلامێ بت، وحسێبا وان ل سەر خودایێ بلندە.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە پێپک وبناخەیێن دینی بۆ مە دەسنیشان دکەت: تەوحیدا خودێ، وکرنا نڤێژێ، ودانا زەکاتێ، وجیهادا د رێکا خودێ دا.. هەر وەسا حەرامیا خوین ومالێ موسلمانی دیار دکەت، وئاشکەرا دکەت کو ئیسلامێ هندەک ئەحکامێن دی ژی هەنە، شەڕ سەرا دئێتەکرن.

ل دەسپێکا حەدیسێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕادگەهینت کو خودایێ وی فەرمان ل کرنا جیهادێ ل وی کریە، پێخەمەت بەلاڤکرنا دینی، وخودایێ مەزن ب خۆ ژی دئایەتەکێ دا ڤێ چەندێ دبێژت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ ﴾ (البقرة: ٢١٦) یەعنی: خودێ کرنا شەڕێ نەیاران ل سەر هەوە نڤیسیە (فەرزکریە) وئەو ب خۆ کرنا شەڕی ل بەر هەوە تشتەکێ نەخۆشە، وبەلکی تشتەک هەبت هەوە نەڤێت، وئەو ب خۆ بۆ هەوە یێ باش بت، وبەلکی تشتەک هەبت هوین حەز ژێ بکەن، وخرابیا هەوە تێدا هەبت، وخودێ دزانت وهوین نزانن.

مەعنا ڤێ ئەوە د کرنا جیهادێ دا خێر ومفایێن مەزن بۆ ئوممەتێ هەنە، ژ لایەکی ڤە خرابیان نەیار ودوژمنان ژێ دویر دکەڤت، و ژ لایەکێ دی ڤە ڕێ بۆ بەلاڤکرنا دینی ڤەدبت؛ دا هەچیێ بڤێت موسلمان ببت کەس نەبت ڕێکێ لێ بگرت، وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت کو جیهادا د گەل کافران ل سەر وی (وئوممەتا وی) واجبە هندی، وهنگی شەڕ دێ ئێتە ڕاوەستاندن ئەگەر یێ بەرانبەر ئەڤ کارە کرن یێن حەدیس بەحس ژێ دکەت، هنگی خوینا وان ومالێ وان دێ یێ پاراستی بت، چونکی ئەو هنگی دێ ژ موسلمانان ئێنە حسێبکرن.. و ژ تشتێن ئاشکەرایە کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شەڕ د گەل کیتابیان ژی نەکریە، وڕێ یا دایە وان ئەو ل سەر دینێ خۆ بمینن، ئەگەر هات وئەز رازی ببن جزیێ بدەن.

وئەو کارێن خوین ومالێ خودانی پێ حەرام دبن ئەڤەنە:

١- شاهدەدان: وئەوە مرۆڤی دئینتە د ئیسلامێ دا، لەو دەمێ ئێک دهاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ودڤیا بێتە د ئیسلامێ دا، پێغەمبەری ژ وی دخواست ئەو شاهدە بدەت، وڕۆژا ئوسامەیێ کوڕێ زەیدی ئەو زەلام کوشتی یێ شاهدە دای، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک خۆ ژێ عێجز کر وگۆتێ: چاوا تە ئەو کوشت پشتی وی شاهدە دای؟!

٢- كرنا نڤێژێ: ومەخسەد پێ نڤێژا فەرزە، ئیمامێ نەوەوی دبێژت: ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو یێ ژ قەستا نڤێژێ نەکەت دئێتە کوشتن، و د حەدیسەکێ دا یا موسلم ڤەدگوهێزت، دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەحسێ هندەک مەزنان دکەت کو ل دویماهیا زەمانی دێ حوکمێ موسلمانان کەفتە د دەستان دا، وئەو هندەک کارێن باش وهندەکێن خراب دێ کەن، هندەکان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ما هنگی ئەم شەرێ وان نەکەین؟ گۆت: نە، هندی ئەو نڤێژان بکەن. مەعنا: کرنا نڤێژان ژ لایێ وان ڤە دبتە ئەگەرا نەدورستیا کرنا شەڕی د گەل وان..

و د گەل کو حوکمێ وی یێ ژ قەستا نڤێژێ نەکەت کوشتنە، بەلێ زانایێن ئیسلامێ ب خیلاف چووینە کانێ ئەو دەمێ دئێتە کوشتن حسێب دبت کافر یان نە؟

وکورتیا مەسەلێ ب ڤی ڕەنگیە: ئەگەر وی باوەری ب نڤێژێ هەبت، بەلێ ژ سستی وخەمساری نڤێژێ نەکەت، ئەو دەمێ دئێتە کوشتن دێ حسێب بت موسلمانەکێ گونەهکار، وحالێ وی بۆ خودێ دێ ئێتە هلپسارتن، بەلێ ئەگەر وی باوەری ب نڤێژێ نەبت، ئەو ژ کافران حسێبە، وچو ئەحکامێن موسلمانان ل سەر نائێنە ب کارئینان، وەکی: شویشتنێ وڤەشارتنا ل ناڤ زیارەتێن موسلمانان، ومەسەلا میراتی.. وهتد.

٣- دانا زەکاتێ: وهەر کەسەکێ باوەری نەبت کو زەکات واجبە ئەو ژ کافران دئێتە حسێبێ، وشەڕێ وی حەلال دبت، وئەوێ ب دیرۆکێ شارەزا بت دزانت کو خەلیفێ پێغەمبەری یێ ئێکێ ئەبوو بەکری شەڕێ وان عەرەبان کر یێن زەکات نەدای، وئەو ژ (مورتەددان) حسێبکرن، ودەمێ عومەری گۆتییێ: چاوا تو دێ شەڕێ وان کەی وئەو دبێژن: (لا إلـه إلا اللـه)؟ ئەبوو بەکری گۆت: ب خودێ ئەز دێ شەڕێ وان کەم یێن جوداهیێ دئێخنە ناڤبەرا نڤێژێ وزەکاتێ. و د ئایەتەکێ خودایێ مەزن بەحسێ کافران وشەڕێ د گەل وان دکەت ودبێژت: ﴿ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْۚ إِنَّ

ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (التوبة: ٥) يەعنى: ئەگەر وان تۆبەكر ونڤێژ كرن، وزەكات دا، هوين رێكا وان بەردەن، يەعني: شەرێ وان نەكەن.. وئەڤە هندێ دگەهينت كو دانا زەكاتێ ژى ئێک ژ ئەگەرێن پاراستنا خوين ومالێ وانە.

٤- وەدەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ئەگەر وان ئەڤ چەندە كر، وان خوين ومالێ خۆ ژ من پاراست، وەسا نەبت ب حەقێ ئیسلامێ بت.. مەعنا وێ ئەوە هندەک تشتێن دی ژی -د ئیسلامێ دا- هەنە ئەگەر خەلک نەكەن، حەقێ دەسهەلاتێ هەيە شەرێ وان سەرا بكەت، وئەو تشت وەكی زانا دبێژن ستوينێن دی یێ ئیسلامێنە، وەكی رۆژیێ وحەجێ، سەعیدێ كورێ جوبەیری دبێژت: عومەرێ كورێ خەططابی دگۆت: ئەگەر خەلک حەجێ بهێلن ئەم دێ شەرێ وان سەرا كەين، كا چاوا ئەم شەرێ وان سەرا نڤێژێ وزەكاتێ دكەين. وئاشكەرايە كو د ئەحكامێن شەرعی یێن ئیسلامێ دا هندەک تاوان ژی هەنە حوكم پێ ب كوشتنێ ل سەر خودانی دئێتەدان، وەكی: كوشتنا مرۆڤەكی بێ حەق، وكرنا زنایێ ب نسبەت مرۆڤی ب ژن یان ژنا شویكری، وشەقكرنا رێزا موسلمانان وتێكدانا ئێكەتیا وان، بەلێ ئەڤە دەمێ حوكم ب كوشتنا وان دئێتەدان ژ لایێ مەحكەما شەرعی ڤە، ئەوحسێب نابن كافر.

وئەوێ ئەحكامێن ئیسلامێ ب جهـ بینت، ودینداریێ ئاشكەرا بكەت، موعامله وسەرەدەریا موسلمانی دێ د گەل ئێتەكرن، وخوينا وی ومالێ وی دێ ئێنە پاراستن، ئەگەر خۆ د دل دا وی باوەری ب ڤێ چەندێ نەبت ژی، هنگی ئەو دێ حسێب بت منافق، ومنافقی حسێبا وی ل سەر خودێیە، و ل بەر سیبەرا ئیسلامێ چێ نابت بۆ دەسهەلاتێ حسێبێ ل سەر ئنیەتێ د گەل خەلكی بكەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت كو جیهاد وكرنا شەرێ كافران واجبە ل سەر مەزنێ موسلمانان؛ دا رێ بۆ بەلاڤكرنا دینی ڤەبت

٢- وئەڤ حەدیسە رەددە ل سەر وان كەسان یێن دبێژن: باوەریێ چو هەوجە ب كریاران نینە، وئەو كەسێ ب دلی باوەری هەبت بلا چو كاران نەكەت ژی كافران نابت. وئەوێن ل سەر ڤێ باوەرێ (مەرجئینە) وگۆتنا وان یا دورست نینە، باوەری ب دلی و ب كریارانە ژی، ئەگەر نە.. جیهاد د گەل وان كەسان دورست نەدبوو یێن وان كاران نەكەن ئەوێن د حەدیسێ دا هاتی، و ژ بەر ڤێ چەندێ ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە دكرە دەلیل دژی مەرجئیان.

٣- حەدیس گرنگیا شاهدەدانێ، وكرنا نڤێژێ، ودانا زەكاتێ، بۆ مە ئاشكەرا دكەت، وكو ئەو ژ وان تشتانە یێن خوین ومالێ خودانی دپارێزن.

٤- وحەدیس دەلیلە ل سەر هندێ كو كارێن بەرچاڤ ژ خودانی دئێنە قەبویلكرن، وحوكم ب دورستیا وان دئێتەدان، ومەسەلا ئنیەتێ ودلی ئەڤە تابعی خودێیە، وئەم مایێ خۆ تێ ناكەین.

٥- وئەو دەلیلە ل سەر هندێ ژی كو دەستەكێن بیدعەچی، ئەوێن ئەحكام وستوینێن ئیسلامێ ب جھ دئینن، ژ موسلمانان حسێب دبن، وحوكم ب كوفرا وان نائێتەدان، وجیهاد دژی وان نائێتەكرن.

## حەدیسا نەهێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قال: سَمِعت رَسُولَ الله -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ: ﴿ مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ، وَاخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ ﴾.

**رواه البخاري ومسلم**

ژ ئەبوو هورەیرەی عەبدررەحمانێ کورێ صەخری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو -سلاڤ لێ بن- دگۆت: تشتێ من نەهیا هەوە ژێ کربت خۆ ژێ بدەنە پاش، وتشتێ من فەرمان پێ ل هەوە کربت هندی هوین بشێن بکەن، چونکی هەما وێ چەندێ یێن بەری هەوە بربوونە هیلاکێ پسیارکرنا وان یا زێدە، وجودابوونا وان ژ پێغەمبەرێن وان.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە ژی ئێک ژ حەدیسێن کۆمکەره؛ چونکی ئەو هندێ دگەهینت کو پێتڤیە مرۆڤێ موسلمان دویکەفتنا ئەمر ونەهیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەت، وخۆ ژ وان کاران بدەتە پاش یێن بووینە ئەگەرا تێچوونا ئوممەتێن بەرێ. ژ بر ڤێ چەندێ ئیمامێ نەوەوی دبێژت: ئەڤ حەدیسە ئێک ژ پێپک وبناخەیێن ئیسلامێنە.

و د دەر حەقا ئەگەرا گۆتنا ڤێ حەدیسێ دا د ریوایەتەکێ دا ل نک ئیمامێ موسلم هاتیە کو جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- خوتبەک بۆ

صەحابیان دخواند، ئینا گۆتە وان: گەلی مرۆڤان، خودێ حەج ل سەر هەوە فەرزکر، ڤێجا هەرنە حەجێ، ئینا زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر سال بچین؟ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا وی نەدا، سێ جاران وی ئاخفتنا خۆ ڤەگێرا، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەگەر ئەز بێژم: بەلێ ئەو دێ ل سەر هەوە واجب بت، وهوین نەشێن وە بکەن، پاشی ئاخفتنەکا وەکی ڤێ گۆت یا مە ل سەری ئینای.

و د ریوایەکێ دا ل نک (ئبن ماجەی) هاتیە کو ئەو زەلامێ پسیار کری ئەقرەعێ کورێ حابسی بوو.

مەعنا: هەر وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێ نەخۆش بوو وی زەلامی ئەڤ پسیارە کری، لەو جارا ئێکێ بەرسڤا وی نەدا، بۆ هندێ دا ئەو خۆ بێ دەنگ بکەت، وگاڤا دیتی کو ئەو خۆ بێ دەنگ ناکەت قاعیدەیەکێ شەرعی بۆ وی وبۆ خەلکێ دی ژی ئاشکەراکر، ئەو ژی ئەڤەیە: ئەو پسیارێن زێدە، وبێ مفا نەکەن، وئەگەر جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتنەک گۆت، بلا ئەو کاری پێ بکەن، وگەلەک ل دویڤ نەچن، وپسیارێن زێدە ژی نەکەن؛ دا حوکم ل سەر وان نەئێتە شداندن، چونکی هندی پسیارکەر پتر ل دویڤ مەسەلێ بچت قەیدێن زێدەتر دێ ل بەر ئێنەدانان، وسەرهاتیا ئسرائیلیان د گەل پێغەمبەرێ وان مووسای وڤەکوشتنا چێلێ، ئەوا د سوورەتا (البقرة) دا بۆ مە هاتیە ڤەگێران، ل بەر مە هەمیان یا ئاشکەرایە، وان پسیارێن زێدە کرن، خودێ ل وان شداند حەتا نێزیک بوو ئەو چێل ب دەست وان نەکەفتی یا فەرمان ب ڤەکوشتنا وێ ل وان هاتیەکرن.

وحەدیس شریعەتی ل سەر دو تشتان لێکڤە دکەت: ئەو کارێن نەهی ژێ هاتیەکرن، یەعنی: خودێ وپێغەمبەرێ وی ژ مە خواستی ئەو وان کاران نەکەین، وحەرام ومەکرووهـ هەردو دکەڤنە بن ڤێ پشکێ، حەرام ئەوە یێ مرۆڤ ب کرنا وی گونەهکار دبت، و ب نەکرنا وی خودان خێر دبت، ومەکرووهـ ئەوە یێ ب نەکرنا خودان خێر دبت و ب کرنا گونەهکار نابت،

وئەڤێ پشکێ دڤێت ئەم ئێکجار خۆ ژێ بدەینە پاش ونێزیک نەبین، هنگی تێ نەبت ئەگەر ئەم نەچار ببین ومە چو رێکێن دی نەبن، هنگی دورستە بۆ مە ل دویڤ قەدەر هەوجەییا خۆ ئەم وان کاران بکەین زێدەتر نە.

یا ددوێ: ئەو کارێن فەرمان ب کرنا وان ل مە هاتیەکرن، وواجب وسوننەت دکەڤنە د بن دا، واجب ئەوە یێ ب کرنا وی مرۆڤ خودان خێر دبت، و ب نەکرنا وی گونەهکار دبت، وسوننەت ئەوە یێ ب کرنا وی مرۆڤ خودان خێر دبت، و ب نەکرنا وی گونەهکار نابت، واجبی دڤێت ئەو بکەت، وکارێ سوننەت ل دویڤ شیانا خۆ وهندی ژێ بێت بکەت.

و ژ گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: هوین هندێ ژێ بکەن هندی هوین بشێن.. زانایان قاعیدەیەکێ شەرعی دانایە، ئەو ژی ئەڤەیە: ئەگەر مرۆڤ نەشیا واجبەکی هەمیێ بکەت، بلا هندێ بکەت هندی بشێت، وەکی بۆ نموونە: ئەگەر نەشیا خرابیەکێ ئێکجار ڕاکەت، بەلێ پێڤە هات هندەکێ کێم کەت، دڤێت ئەو وێ هندەکێ نەهێلت، یان: هندەک ئاڤ ل نک وی هەبوو بەلێ تێرا شویشتنا دەسنڤێژێ نەکر، هندی ئاڤ تێرا بکەت بلا ئەو بشۆت، وبۆ ئەندامێن مایی تەیەمموومێ بگرت، یان ئەگەر شیا بۆ کرنا نڤێژێ ڕابت وڕوینت، بەلێ نەشیا بۆ سووجوودێ خۆ بچەمینت، دڤێت ئەو ڕابت وڕوینت، وبلا نەچتە سوجوودێ.. وهۆسا، وئەڤەیە مەعنایا گۆتنا زانایان: تشتێ مرۆڤ بشێت بکەت ڕانابت ژ بەر تشتێ مرۆڤ نەشێت (المیسور لا یسقط بالمعسور).

وئەڤ حەدیسە بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو ئێک ژ ئەگەرێن تێچوونا ئوممەتێن بەری مە (وبەلکی مەخسەد پێ ئسرائیلی بن) ئەو بوو وان گەلەک پسیارێن زێدە وبێ مفا ژ پێغەمبەرێ خۆ دکرن، وپشتی پێغەمبەرێن وان بەرسڤا وان ددا، وان ب گۆتنا وان نەدکر، یەعنی: وان پسیار دکرن وگاڤا بەرسڤ ب دلێ وان نەبا، وان وەسا دکر وەکی دلێ وان دچتێ.. ومخابن نوکە د ناڤ ئوممەتا مە ژی دا گەلەک کەسێن ب ڤی ڕەنگی هەنە، کار

وكەسبێ وان پسیارن، نە بۆ هندێ دا علمەکی ل نک خۆ پەیدا بکەن، یان دینێ خۆ بزانن، بەلکی بۆ هندێ دا ئەو تشتەکی ببینن خۆ پێڤە موژیل بکەن، وجەدەلێ ل دۆر بکەن، یا ئەڤە چاوایە؟ بۆچیە؟ بۆچی فلان کەس وە نابێژت؟ یا ئەگەر فلان تشت هۆ لێ هاتە هە ئەم دێ چ کەین؟ یا دێ پسیارا تشتەکی کەت حەتا ئەو دمرت ژی ئەو هەوجەی وی تشتی نابت.. مرۆڤەکێ نزانت باش دەسنڤێژێ بشۆت سەعەتەکێ جەدەلێ دێ کەت کانێ خوارنا گۆشتێ هەسپان چاوایە! ئێک نزانت ئەرکانێن نڤێژێ چەندن بۆ خۆ پسیارا ئەرکانێن نڤێژێ ناکەت دێ مینتە ب مەسەلا (ئستنساخا مرۆڤان) ڤە کانێ چاوایە!! مەعنا: ئارمانج هەڤرکی وجەدەلە نە وەرگرتنا فایدەیە.

وعەدەتێ صەحابیان بوو تشتێ ئەو هەوجە نەببانێ وان پسیارا وی نەدکر، ئەنەس دبێژت: نەهیا مە هاتبوو کرن ئەم پسیارێن زێدە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بکەین، ڤێجا کەیفا مە گەلەک دهات دەمێ زەلامەکێ عاقل ژ بادیێ هاتبا پسیارەک ژ پێغەمبەری کربا ومە گوهێ خۆ دابایێ.. وزەیدێ کورێ ثابتی دەمێ مرۆڤەکی پسیارەک ژێ کربا دا بێژتێ: ئەڤتشتە هەیە یان نە؟ ئەگەر گۆتبا: نە، دا بێژتێ: گاڤا ئەو تشت چێبوو پاشی وەرە پسیارێ بکە.

ویا ژ ڤێ ژی کرێتتر، کو دبتە ئەگەرا تێچوونا خودانی، ئەوە ئەو پسیارا تشتەکی بکەت، وگاڤا بەرسڤا دورست ب دەلیل بۆ هاتە ئاشکەراکرن، ئەو خۆ دفن بلند بکەت، وحەقیێ قەبویل نەکەت، وکاری ب وێ بەرسڤێ نەکەت، وەکی وان یێن بۆ ترانە ویاری پسیارا ئەحکامان دکەن، وگاڤا زانایەکی ئەو حوکم بۆ وان ئاشکەرا کر، ل شوینا ئەو کاری پێ بکەن، دێ چن ل عەردان وێ بەرسڤێ بێژن، وکەنە جهێ پێکەنینێ..

و ژ ڤان رەنگە پسیاران دەرکەڤت، پسیارکرن بۆ هندێ کو مرۆڤ دینێ خۆ بزانت، وکاری پێ بکەت، تشتەکێ فەرە وەکی خودێ د ئایەتەکێ دا گۆتی: ﴿ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (النحل: ٤٣).

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ئـەڤ حـەدیـسـە هندێ دگـەهینـت کـو یـا بـاش نینـە مـرۆڤ گـەلـەک پسیاران بکەت، ب تایبەتی وان پسیارێن ئەوهەوجە نەبتێ.

٢- وحەدیس هندێ دگەهینت کو دڤێت مرۆڤ گرنگییێ بدەتە تشتێ فەرتر پاش یێ فەراتیا وی کێمتر.

٣- ئێک ژ ئەگەرێن تێبرنا ئوممەتێن بەری مە ئەو بوو وان گەلەک پسیار ژ پێغەمبەرێن خۆ دکرن، وکار ب بەرسڤێن وان نەدکر.

## حەدیسا دەهێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ –رضي الله عنه– قال: قَالَ رَسُولُ الله –صلى الله عليه وسلم– يَقُولُ: ﴿ أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ الله طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا) وَقَالَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ) ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ، أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟! ﴾.

رواه مسلم

ژ ئەبوو هورەیرەی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: گەلی مرۆڤان، هندی خودێیە یێ پاکە، وتشتێ پاک نەبت ئەو قەبویل ناکەت، وهندی خودێیە ب وی تشتی فەرمان ل خودان باوەران کریە یێ فەرمان پێ ل پێغەمبەران کری، وگۆت: گەلی پێغەمبەران، ژ تشتێ پاقژ بخۆن، وکارێ چاک بکەن، وگۆت: گەلی ئەوێن باوەری ئینای، ژ رزقێ پاقژێ مە دایە هەوە بخۆن.. پاشی وی بەحسێ زەلامی کر: سەفەرێ درێژ دکەت، یێ سەرقژ وتۆزەوی، دەستێن خۆ بەر ب عەسمانی ڤە درێژ دکەت: یا رەببی یا رەببی! وخوارنا وی یا حەرامە، وڤەخوارنا وی یا حەرامە، وجلکێ وی یێ حەرامە، وگۆشتێ خۆ ب حەرامی یێ گرتی، ئەرێ چاوا دێ بەرسڤا وی ئێتەدان.

موسلم ڤەدگوهێزت

گرنگیا ڤێ حەدیسێ ژ هندێ دئێت ئەو بەحسێ شەرتێ قەبویلکرنا وان کاران دکەت یێن مرۆڤ خۆ پێ نێزیکی خودێ دکەت، کو پاقژبە، وئەو بەرێ مرۆڤی ددەتە گرنگیا هندێ کو خوارن وڤەخوارن وجلکێ مرۆڤی ژ مالەکێ حەلال بت، وخۆ ژ مالێ حەرام بدەتە پاش یێ کو دبتە ئەگەرا نەقەبویلکرنا دوعایێن وی، ودوعا وەکی ئەم دزانین مەزنترین عیبادەتە بۆ خودێ دئێتە پێشکێشکرن.

د دەسپێکا گۆتنا خۆ دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پاک وپیرۆزیا خودێ ژ هەر عەیب وکێماسیەکا هەبت بۆ مە بەرچاڤ دکەت، دەمێ دبێژت: ﴿ إِنَّ الله طَيِّبٌ ﴾ وپەیڤا (طیب) ل ڤێرێ ب رامانا پاک وپیرۆزیێ دئێت، وچونکی خودێ یێ پاکە ئەو بەس وی تشتی قەبویل دکەت یێ پاک بت: ﴿ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا ﴾ وهەر چەندە ل ڤێرێ پتر هزر بۆ هندێ دچت کو مەخسەد ب تشتێ دئێتە قەبویلکرن ویێ نەئێتە قەبویلکرن، دانا خێرانە، یەعنی: ئەو مالێ تو ب خێر ددەی حەتا ژ تە بێتە قەبویلکرن دڤێت یێ پاقژ وحەلال بت، بەلێ دبت مەعنا هێشتا بەرفەرهتر ژی بێتە وەرگرتن، یەعنی: هەر کار وگۆتنەکا مرۆڤ بکەت حەتا بێتە قەبویلکرن وبۆ خودانی ب خێر بێتە نڤیسین، دڤێت یێ پاک، وپاکی ئەوە ئەو یێ حەلال بت، و ل دویڤ شریعەتی بت.. ودەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: خودێ قەبویل ناکەت، دو مەعنا ژێ دئێنە وەرگرتن: قەبویل ناکەت، یەعنی: ئەو کار ژ بنی یێ بەطالە، هەر وەکی خودانی نەکری، یان ئەو خێرا وی کاری ب تمامی بۆ خودانی نائێتەدان، چونکی هندەک کێماسی تێدا هەنە. و ژ بەر کو تشتێ پاک نەبت خودێ قەبویل ناکەت، وی فەرمان ل پێغەمبەرێن خۆ ب تایبەتی، وخودان باوەران ب گشتی کریە کو ئەو ژ رزقێ حەلال بخون، وحەتا رزقێ وان یێ حەلال بت، دڤێت ئەو کارێ ئەو دکەن ژی یێ ئەو رزق پێڤە دئێت، یێ حەلال بت؛ چونکی خوارنا پاریێ حەلال دبتە ئەگەرا هندێ عیبادەتێ مرۆڤی ژێ بێتە قەبویلکرن، وبەرێ هەمیان دوعا.

وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا ئیشارەتێ ددەتە هندەک شەرتێن دبنە ئەگەر کو دوعایێن مرۆڤی ژ بەر قەبویل ببن، ژ وان شەرتان:

١- پاکی وەکی گۆتی: ﴿ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا ﴾ وپاکی د دوعایێ دا ئەوە ئیخلاص تێدا هەبت، یەعنی: ژ خودێ بت وبۆ خودێ بت، ویا دویر بت ژ هەمی ڕەنگێن ریمەتیێ ومەدحە ومەخسەدێن خراب.

٢- سەفەر، چونکی د سەفەرێ دا، ب تایبەتی ئەگەر درێژ بوو، مرۆڤ دێ نەخۆشیا خەریبیێ وزەحمەتێ بینت، وهنگی دلێ وی دێ نازک بت، وئەو ب نەفسەکا شکەستی دێ دوعایێ کەت، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ زەلامی کر سەفەرێ درێژ دکەت.. یەعنی: ئێک ژ ئەگەرێن قەبویلکرنا دوعایێ ل نک وی پەیدا دبن، پاشی چ؟

٣- پاشی گۆت: ﴿ أَشْعَثَ، أَغْبَرَ ﴾ یەعنی: پرچا سەرێ وی یا قژاڤژە، وجلک وسەروبەرێ وی یێ تۆزەویە، وئەڤە ئیشارەتە بۆ گوهۆڕینا هەیئەت وسەروبەری وەک نیشان بۆ خۆشکاندنێ، ومرۆڤ دەمێ دوعایێ دکەت ئەگەر نیشانێن خۆشکاندنێ بۆ خودێ ل سەر خۆ ئاشکەرا بکەت، وەکی گریێ یان نە پویتەپێکرنا ب کەشخەییا جلکی وسەروبەری پتر یا بەرعەقلە کو دوعایا وی بێتە وەرگرتن، وهەر ژ بەر ڤێ چەندێ بوویە دەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەردکەفتە نڤێژا بارانێ کراسێ خۆ ڤاژی دکر، و ب خۆشکاندن ڤە دەردکەفت.

٤- د دویڤ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ ﴾ دەستێن خۆ بەر ب عەسمانی ڤە بلند دکەت، وئەڤە ژی ئێک ژ ئادابێن دوعایێنە، د حەدیسەکێ دا یا (ئەحمەد وئەبوو داوود وترمذی) ڤەدگوهێزن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ، أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا ﴾ هندی خودایێ هەوەیە یێ شەرمین ومەردە، شەرم ژ عەبدێ خۆ دکەت دەمێ ئەو دەستێن خۆ ب نک وی ڤە بلند

دکەت، ئـەو وان ڤـالا بزڤرینـت.. هـزر بکـە مرۆڤەکێ گەلەکێ مـەرد بـت، و د سـەر مـەدینیا خۆ ڕا یێ شەرمین ژی بت، تو دەستێ خۆ ل بـەر ڤـەگری، و ب خۆشکاندن ڤـە تـشتەکی ژێ بخوازی، تـو بێـژی ئـەو دەسـتێ تـە خـالی بزڤرینت؟

پا هوین بۆ خودێ چ دبێژن؟

٥- وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ کیس دەڤێ وی زەلامـی ڤـەدگوهێزت، ودبێـژت: ئـەو دبێـژت: ﴿ یَـا رَبِّ یَـا رَبِّ ﴾ یـەعنـی: زێدە ئیلحـاحێ د دوعـایێ دکـەت، دبـێـژت ودبێژتە ڤە، نەدوەستییێت ونە بێ هیڤی دبت، ئەڤـە ژی ئێـک ژ ئـەگـەرێـن قـەبویلکرنـا دوعایێنـە، لـەو پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- دەمـێ دوعایەک کربا، وی دو سێ جاران ئەو دوبارە دکر..

ئـەڤـە ئـەو ئـەگـەرن یـێن دوعـا ژ بـەر دئێنـە قـەبـویلکرن، وی زەلامـی یـێ پێغەمبەری بەحسێ وی کری، ئەو هەمی ل نـک خـۆ یـێ پـەیدا کـرین، بـەلـێ تشتەکێ دی یێ گەلەکێ گرنگ وی ژ بیرکریە و ل نک وی نینە: ﴿ وَمَطْعَمُـهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ ﴾ کو خـوارن وڤـەخوارن وجلکـێ وی یێ حەلال بت.. سەعدێ کوڕێ ئەبوو وەققاصی داخواز ژ پێغـەمبـەری کـر کو ئەو دوعایێ بۆ وی ژ خودێ بکەت؛ دا ئەو دوعـایێن وی قـەبویـل بکـەت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ﴿ أطـب مطعمـك تكـن مـستجاب الـدعوة ﴾ خوارنا خۆ حەلال بکـە، دوعـایێن تـە دێ قـەبویـل بـن، وەکـی طـەبـەرانـی ژێ ڤەدگوهێزت.

وئەو کەسێ خەمێ ژ حەلالیا پارێ خۆ نەخوت، وڤـەخـوارن وجلکـێ خـۆ ژی، یێ هەژی نابت خودێ دوعایا وی قەبویل بکەت، لـەو پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ وی زەلامـی کـری یـێ ب وی ڕەنگـێ ژێگـۆتی دوعـا کرین، بەلێ خوارن وڤەخوارن وجلکێ وی یـێ حـەرام ب عـەجێبـی ڤـە پـسیـار کر: ئەرێ چاوا دوعایا وی دێ قەبویل بت؟!

**مفاییّن حەدیسیّ:**

١- ئـەڤ حـەدیسـە گرنگیا پاقژییّ د قـەبویلکرنـا کـار وگۆتنـان دا بـۆ مـە بەرچاڤ دکەت.

٢- هەر وەسا بەریّ مە ددەتە گرنگیـا خـوارن وڤـەخـوارن وجلکـیّ حـەلال، وکو ئەو ژ ئەگەریّن قەبویلکرنا دوعاییّنە.

٣- وحەدیس هندەک ئـەگـەریـن دی ژی ییّن قـەبویلکرنـا دوعـاییّ بـۆ مـە ئاشکەرا دکەت.

## حەدیسا یازدێ

عَنْ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، سبط رسول الله -صلى الله عليه وسلم- وريحانته -رضي الله عنهما- قَالَ : حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ الله -صلى الله عليه وسلم-: ﴿ دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ ﴾.

رواه النسائي والترمذي، وقال: حسن صحيح

ژ حەسەنێ کورێ عەلی، نەڤیێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ورحانا وی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: من ژ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ئەڤ گۆتنە ژبەرکریە: ئەو تشتێ تو یێ ژێ ب گومان بی بهێلە، هەر وی تشتی یێ تو یێ ژێ ب گومان نەبی.

نەسائی وترمذی ڤەدگوهێزن.

ئەڤ حەدیسە ئیشارەتێ ددەتە ئێک ژ بناخەیێن دینێ مە، ئەو ژی خۆ دویرکرنا ژ وی تشتیە یێ مرۆڤ ژێ ب گومان بت، حەتا خۆ ژێ پشت ڕاست بکەت، وئەڤە ئەوە یا دبێژنێ: (تەقوا) یان (وەرەع)، ئەوا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پتر جارا د خوتبێن خۆ دا وەصیەت پێ ل موسلمانان دکر.

حەسەنێ کورێ عەلیێ کورێ ئەبوو طالبی، کورێ فاطمایا کچا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ئەوێ دبێژنێ: رحانا پێغەمبەری؛ ژ بەر کو بێنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ب وی دهات، وگاڤا ددیت گەلەک کەیف خۆش دبوو، دئێتە هژمارتن ژ وان صەحابیێن ب عەمری ڤە دبچویک؛ چونکی دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- قەستا خودایێ خۆ کری، ژیێ حەسەنی نێزیکی دەهـ سالان بوو، حەسەن دبێژت: تشتێ من ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژبەرکری، یەعنی: مایە ل بیرا من ژ گۆتنێن وی، ئەڤ گۆتنەیە، وی

گۆت: ئەو تشتێ تە ب شک بێخت وتو یێ ژێ ب گومان بی، بهێلە، وهەرە وی تشتی بکە یێ تو ژێ ب گومان نەبی.. وتماميا حەديسێ وەکی ل نک (ترمذی) هاتی، ئەڤەیە: ﴿ فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ ، وَإِنَّ الكَذِبَ رِيبَةٌ ﴾ يەعنی: هندی ڕاستیە دلرحەتیە، وهندی درەوە شکە بۆ دلی، و ژ ڤێ دئێتە زانین کو مرۆڤ دڤێت وان کاران نەکەت یێن شک تێدا هەبت، دا یێ پاراستی بت ژ حەرامیێ ڤە ژ لایەکی ڤە، و ژ لایەکێ دی ڤە دا ئەو ژ ئەمانێ خەلکی ژی پاراستی بمینت. هەر وەسا ئەڤە ئیشارەتەکە ژی کو مرۆڤ ل دلێ خۆ بزڤڕت ئەگەر هات وئەو د تشتەکی دا کەفتە گومانێ.

وئەگەر ئەم ل دیرۆکا پێشییێن ڤێ ئوممەتێ بزڤڕین، ژ جیلێ صەحابیان ودویکەفتییێن وان یێ چاک، دێ بینین وان گەلەک خۆ ژ وان تشتان ددا پاش یێن ئەو تێدا دکەفتنە گومانێ، حەتا گەلەک جاران وان خۆ ژ حەلالی ددا پاش ژ ترسێن هندێ دا کو ئەو بکەڤنە د حەرامی دا..

بۆ نموونە: جارەکێ عەبدەکێ ئەبوو بەکری هاتە نک، تشتەک ڤێ بوو، هندەک ژێ دا ئەبوو بەکری، ئینا ئەبوو بەکری ئەو کرە د دەڤێ خۆ دا، وپشتی داعویرای وی گۆتە ئەبوو بەکری: تو دزانی ئەو یێ چ بوو تە ژێ خواری؟ گۆتێ: یێ چ بوو؟ وی گۆت: د جاهلیەتێ دا من خێڤزانکی بۆ مرۆڤەکی کربوو، ومن چو ژ خێڤزانکییێ نەدزانی، من ئەو خاپاند، ژ نوی من ئەو دیت وی ئەڤ مالە دا من.. ئینا ئەبوو بەکری تبلا خۆ برە گەرویا خۆ ودلێ خۆ ڕاکر..

ویەزیدێ کوڕێ زەریعی گاڤا بابێ وی مری پێنج سەد هزار ژ میراتێ وی گەهشتنێ، وی ئەو وەرنەگرت، چونکی بابێ وی بووبوو والی بۆ هندەک مەزنان، ئەو دترسیا مالێ بابێ وی یێ حەلال نەبت!

ونموونە ئەگەر ئەم ل دویڤ بچین، گەلەکن.

ومەسەلەک ل ڤێرێ هەیە دڤێت ئەم بیرا خۆ لێ بینینە ڤە، ئەو ژی ئەڤەیە: ئەڤ ڕەنگێ وەرەعێ یێ ژ هەژی وان کەسانە یێن ب تەقوا بن، وحالێ وان د گەل (ئیستقامێ) یێ دورست بت، نە وەکی وان یێن خۆ ژ حەرامی وگەنەهێن مەزن نەدەنە پاش، وخۆب ڤی ڕەنگێ وەرەعێ نیشا خەلکی بدەن، یەعنی: واجباتێن شەرعی ب جهـ نەئینن، وخۆ ژ شوبوهاتان بدەنە پاش.. ئەڤ ڕەنگێ هۆسا یێ مرۆڤان، وەرەعا وان جهێ گومانێیە، وزوی ب زوی دڤێت مرۆڤ باوەر ژ وان نەکەت، ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ هندەک عیراقیان پسیارا خوینا پێشیێ ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی کری کانێ یا حەلالە یان نە؟ وی بەرسڤا وان نەدا وگۆت: حوسەین یێ کوشتی، وپسیارا خوینا پێشیێ ژ من دکەن!!

وجارەکێ زەلامەکی پسیار ژ بشرێ حافی کر، گۆتێ: ئەگەر زەلامەکی دەیکا وی بێژتێ: ژنا خۆ بەردە، گوهێ خۆ بدەتێ یان نە؟ وی گۆت: ئەگەر وی د هەمی تشتان دا گوهداریا دەیکا خۆ کربت، بلا د ڤی تشتی ژی دا گوهداریا وێ بکەت، ژ خۆ ئەگەر ب ڤی تشتی ب تنێ گوهێ خۆ بدەتە دەیکا خۆ پاشی ڕابت وێ بقوتت، بلا وە نەکەت!

وئەڤە بیرا مە ل وان زەلامان دئینتە ڤە ئەوێن د چو تشتان دا گوهداریا شریعەتی ناکەن، ودو ژنان دئینن دبێژن: مانێ شریعەتی یێ دورست کری لەوا.. هەر وەکی وان شریعەت هەمی یێ ب کارئینا هەما ئەڤ مەسەلە ب تنێ مابوو!!

**مفایێن حەدیسێ:**

ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو پێتڤیە مرۆڤێ خودان باوەر یێ خودان وەرەع وتەقوا بت، خۆ ژ وانکاران بدەتە پاش یێن گومانێ بۆ وی چێ دکەن، وقەستا وان کاران بکەت یێن گومان تێدا نەبت.

## حەدیسا دوازدێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه-، قَالَ رَسُولُ الله -صلى الله عليه وسلم-: ﴿ مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ المَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ ﴾.

رواه الترمذي

ژ ئەبوو هورەیرەی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ژ باشیا موسلمانەتیا مرۆڤیە ئەو وی تشتی بهێلت یێ مایێ وی تێ نەچت.

ترمذی ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە ئێک ژ بناخەیێن تۆرە وئادابێن جڤاکی یێن مرۆڤێ موسلمان بەرچاڤ دکەت، وئاشکەرا دکەت کو ژ تامیا موسلمانەتیا مرۆڤی ئەوە ئەو مایێ خۆ د وی تشتی نەکەت یێ پەیوەندی ب وی ڤە نەبت ومایێ وی تێ نەچت، ومایتێکرن ئەوا ئیسلام مە ژێ ددەتە پاش پتر جاران ب رێکا ئەزمانی دبت، ومرۆڤێ خودان باوەر ئەگەر ل بیرا خۆ بینتەڤە کو هەر گۆتنەکا ئەو بێژت ل سەر وی دئێتە هژمارتن، ورۆژەک دێ ئێت حسێبا وێ دێ د گەل وی ئێتەکرن، ئەو ل ئەزمانێ خۆ دێ یێ هشیار بت، ووێ گۆتنێ نابێژت یا مایێ وی تێ نەچت.. ودبت هندەک کەس هەبن هزر بکەن خودێ وێ ئاخفتنێ ل وان ناگرت یا ئەو دبێژن، وصەحابیێ پێغەمبەری موعاذێ کورێ جەبەلی ب خۆ ژی ئێک ژ وان بوو، دەمێ ب عەجێبی ڤە پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما سەرا

وان ئاخفتنێن ئەم دبێژین دێ ل مە ئێتەگرتن؟ پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- گۆتێ: ئەری ما ئەگەر ژ بەر گۆتنا ئەزمانی نەبت تشتەک هـەیـە مرۆڤـێ سـەر وسەر بهاڤێتە د ئاگری دا؟!

ئیمـامێ نـەوەوی دبێژت: ((پێتڤیـە مـرۆڤ ئـەزمـانێ خـۆ ژ وێ ئـاخفتنێ بگرت یا مەصلحەت تێدا نەبت، وهەر جارەکا ئاخفتن ونەئاخفتن وەکی ئێک بت، یا سوننەت ئـەوە مـرۆڤ نـەئاخڤت، چـونکی دبت ئاخفتنا حەلال سـەری بکێشتە کارەکێ حەرام یان مەکرووه وئەڤە گەلەک جاران چێ دبت..)).

وتشتێ بەرچاڤ وبێ خەلک هەمی دزانت ئـەوە ئاخفتنا تـازە وسـەرخۆ، وبـێ دەنگـی هیبـەتـێ ددەتـە خـودانی، وئاخفتنـا زێـدە وپربێـژی ومـایتێکرن کەسینیا مرۆڤی بێ بها وسڤک دکـەت، وهـەیبـەتا وی د چاڤێن خـەلکـی دا دئینتە خوارێ.

و ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە زانین کو بـاشـی وتـمـامیـا ئیـسلاما مرۆڤـی وی ژ مایتێکرنێ ددەتە پاش، وهەر جـارەکـا ئیـسلاما وی تمـام بـوو خـودێ خێـرا کارێ وی ب زێدەیی دێ دەتێ، وەکی د حەدیسەکێ دا یـا بوخـاری وموسـلمی ڤەگوهاستی هاتی: ﴿ إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ، فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَـهُ بِعَـشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا ﴾ یەعنی: ئەگـەر ئێـک ژ هەوە ئیسلاما خۆ باشـکر، هـەر باشـیەکا ئـەو بکـەت دێ بـۆ وی ب دەهـان ئێتە نڤیسین حەتا دگەهتە حەفت سـەدان، وهـەر خرابیـەکا ئـەو بکـەت دێ بـۆ وی ب وەکی وێ ئێتە نڤیسین.

و ژ لایەکێ دی ڤە باشیا موسلمانەتیا مرۆڤی هندێ ژێ دخوازت ئەو خۆ ژ کارێ نەدورست ژێ بدەتە پاش، وەکی د حەدیسەکێ دا یا بوخاری وموسـلم ڤەگوهاستی هـاتی: ﴿ الْمُسْلِمُ مَـنْ سَـلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِـنْ لِسَانِهِ وَيَـدِهِ ﴾ موسـلمانێ دورسـت ئـەوە یـێ موسـلمان ژ دەسـتێ وی وئـەزمـانێ وی بێنـە پاراسـتن، یەعنی: نە ب ئەزمانێ خۆ ونە ب دەستێ خۆ مایێ خۆ د وان نەکەت.

ژ حەسەنێ بەصری دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: ژ نیشانێن پشتدانا خودێ بۆ عەبدی ئەوە ئەو عەبدی ب وی تشتی ڤە موژیل بکەت یێ مایێ وی تێ نەچت.

وعەبدللاهێ تەستوری دبێژت: هەچییێ د وی تشتی دا باخڤت یێ مایێ وی تێ نەچت، دێ ژ ڕاستگۆیێ بێ بار بت. یەعنی: دێ ڤێری درەوان بت.

ومەعرووفێ کەرخی دبێژت: دەمێ ئاخفتنا عەبدی د وی تشتی دا بت یێ مایێ وی تێ نەچت، مەعنا وێ ئەوە خودێ ئەو یێ شەرمزارکری.

وتشتێ مرۆڤی ژ مایتێکرنێ ددەتە پاش باوەریا ب خودێ وشریعەتە، لەو پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ئەو ژ باشیا ئیسلاما مرۆڤی هژمارت، و ل ڤێرێ دڤێت بێتە دیارکرن کو دو ڕەنگێن مرۆڤان هەنە ژ بەر نەزانینا وان ب شریعەتی دکەڤنە خەلەتییێ:

- هندەک کار وگۆتنێن واجب وسوننەت دهێلن، یا ژ وان ڤە ئەو ژ وان تشتانە یێن مایێ وان تێ نەچت.

- وهندەکێن دی هەنە مایێ خۆ د گەلەک کاران دکەن، چونکی هزر دکەن ئەو ژ وان کارانە یێن مایێ وان تێ دچت.

وحەتا هەر ئێک ب دورستی توخوبێ خۆ بزانت دڤێت خۆ د شریعەتی دا زانا بکەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو پێتڤیەر هەر ئێک ژ مە دەمێ خۆ د وان گۆتن وکاران دا زەعێ نەکەت یێن چو مفایێ وی تێدا نەبن، ومایێ وی تێ نەچت.

٢- وحەدیس هندێ دگەهینت کو ئێک ژ سالۆخەتێن کەسینیا موسلمانێ یا تمام ئەوە ئەو یێ مایتێکەر نەبت، چونکی مایتێکرن خودانی بێ بها دکەت.

٣- وحـەدیـس بـەرێ مـە ددەتـە پاقژکرنـا نـەفـسێ وبلنـدکرنا وێ ژ وان تشتێن وێ کێم دکەت، و د چاڤێن خەلکی دا دشکێنت.

٤- مایتێکرن گەلەک جاران دبتە ئەگەرا پەیدابوونا نەڤیانێ د ناڤبەرا خەلکی دا، ودویر نینە ئەو سەری بکێشتە شەڕ ولێککەفتنێ ژی.

## حەدیسا سێزدێ

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ -رضي الله عنه-، عن رَسُولِ الله -صلى الله عليه وسلم- قال: ﴿ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: باوەریا ئێک ژ هەوە تمام نابت حەتا ئەو بۆ برایێ خۆ بڤێت یا بۆ خۆ دڤێت.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

د حەدیسا بۆری دا، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ ئێک ژ وان تشتان كر یێن ئیسلاما مرۆڤی پێ تمام دبت، و د ڤێ حەدیسێ دا بەحسێ تشتەكێ دی دكەت باوەریا مرۆڤی پێ تمام دبت، وچونكی ئیسلام ب كار وكریاران ڤە یا گرێدایە، وباوەری ب دلی ڤە، ئەو تشتێ ئیسلام پێ تمام دبت، كو نەمایتێكرن بوو، ب كار وگۆتنان ڤە هاتە گرێدان، وئەو تشتێ باوەری پێ تمام دبت، كو مرۆڤی ئەو تشت بۆ برایێ خۆ بڤێت یێ بۆ خۆ دڤێت، ب دلی ڤە هاتە گرێدان.

وئەڤ حەدیسە ئێک ژ وان حەدیسانە یێن زانایان گرنگیەكا مەزن دایێ؛ چونكی ئەو ئێک ژ وان تۆرەیێن مەزن بۆ مە بەرچاڤ دكەت یێن كو پێتڤیە ل نک مرۆڤی هەبن دەمێ ئەو سەرەدەری وتەعامولێ د گەل خەلكی دكەت.

ودەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ﴿ لَا يُؤْمِنُ أَحَـدُكُمْ.. ﴾ ئێـک ژ هەوە باوەریێ نائینت، مەعنا وێ ئەو نینە ئەو دێ کافر بت، وباوەری ئێکجار ل نک وی نامینت، بەلکی مەخسەد پێ ئەوە -وەکی زانا دبێژن- ئەو باوەریەکا تمام نائینت، چونکی ئەوێ ئەڤ سالۆخەتە ل نک نەبت ژی ئەصلێ باوەریێ دێ ل نک هەبت، وئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو ئێک ژ چەقێن باوەریێ ئەوە مرۆڤی خێر بۆ برایێن خۆ یێن موسلمان بڤێت، کەیفا وی بێت دەمێ باشیەک دگەهتە وان، و ب خەم بکەڤت دەمێ دبینت نەخۆشیەک دگەهتە وان، وئیمامێ نەوەوی دبێژت: یا باشتر ئەوە مەعنا (برا)ی د ڤێ حەدیسێ ب رەنگەکێ بەرفرەهتر ژ براینیا باوەریێ بێتە وەرگرتن، ومرۆڤی خێرا بۆ برایێ خۆ یێ کافر ژی بڤێت، کو حەز بکەت ئەو بێتە د ئیسلامێ دا، وبەردەوامیا باوەریێ بۆ برایێ خۆ یێ موسلمان بڤێت، ژ بەر ڤێ چەندێ چەندێ دوعایا هیدایەتێ بۆ کافری تشتەکێ ب خێرە.

وپێغەمبەر ب خۆ -سلاڤ لێ بن- بەری هەر کەسەکێ دی ژ وان بوو یێن خێر بۆ برایێن خۆ دڤیا کانێ چاوا وی ئەو بۆ خۆ دڤیا، ئیمامێ موسلم ڤەدگوهێزت کو جارەکێ ئەبوو ذەرری داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو وی بکەتە مەزنێ جهەکی، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەز دبینم تو مرۆڤەکێ لاوازی، ومن ئەو تشت بۆ تە دڤێت یێ من بۆ خۆ دڤێت، مەزنیا دو مرۆڤان نەکەی، ونەبیە وەکیل ل سەر مالێ ئێتیمەکی.

وصەحابیێن پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- ب ڤی رەنگی بوون، عەبدللاهێ کورێ عەبباسی د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ئەز ئایەتەکا قورئانێ دخوینم وئەز حەز دکەم خەلک هەمی وی تشتی بزانن یێ ئەز ژێ دزانم.

وهەر جارەکا مرۆڤی ئەو خێر بۆ برایێن خۆ ڤیا یا وی بۆ خۆ دڤێت، مەعنا وێ ئەوە دلێ وی د دەر حەقا وان دا یێ صافیە، وچو کەرب ونەڤیانا وان ل نک وی نینە، وئەو حەسویدیێ ب وان نابەت، وئەو کەسێ هۆسا بت دێ باوەریا وی یا تمام بت.

**مفاییێن حەدیسێ:**

١- ژ ڤێ حەدیسێ دئێته زانین کو ئێک ژ سالۆخەتێن کەسینیا مرۆڤێ خودان باوەر ئەوە ئەو یێ (ئەنانینی) نەبت، و ژ وان نەبت یێن حەز دکەن هەمی تشت بۆ وی ب تنێ بن، وخێر نەگەهته کەسەکێ دی ژ بلی وی.

٢- چێ نابت مرۆڤێ خودان باوەر کەسەکێ حەسوید بت، وکەرب ونەڤیانا خەلکی د دلێ وی دا بت.

٣- وئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو باوەری کێم وزێدە دبت، ودبت مرۆڤ کارەکی بکەت باوەریا وی پێ کێم ببت، وکارەکێ دی بکەت باوەریا وی پێ زێدە بت.

٤- ب کارئینانا ڤێ یا د حەدیسێ دا هاتی، کو مرۆڤی خێر بۆ خەلکی هەمییێ بڤێت، وحەز بکەت ئەو بگەهتە وان یا دگەهتە وی، دبتە ئەگەرا بەلاڤبوونا ڤیان وحەژێکرنێ د ناڤبەرا کورێن جڤاکێ دا.

## حەدیسا چاردێ

عَنْ عَبْدِ الله بن مسعود -رضي الله عنه-، قال: قال رَسُولُ الله -صلى الله عليه وسلم-: ﴿ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله وَأَنِّي رَسُولُ الله إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

عەبدلـلاهـێ کـوڕێ مـەسعـوودی -خودێ ژێ رازی بت- ژ پێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ڤـەدگـوهێزت، دبێـژت: پێغـەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- گـۆت: خوینا مرۆڤەکێ موسلمان یێ شاهدە بدەت کو ژ خودێ پێڤـەتر چو خوداییێن حەق نینە وکو ئەز پێغەمبـەرێ خودێمە حەلال نابت، ب ئێـک ژ سێ ڕێکـان نەبت: وئەو ب ژن بت وزناییێ بکەت، ونەفس ب نـەفسێ، وئـەوێ دینـێ خـۆ بهێلت وخۆ ژ جماعەتێ ڤەدەر کەت.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

زانایێ ناڤدار (ئبن حەجەرێ هەیثەمی) ل دۆر مەرتـەبـەیا ڤێ حەدیسێ دئاخڤت ودبێژت: وێ مەرتەبەیەکا گرنگ هەیە؛ چونکی ئـەو ب خـەطـەرتـرین تشتی ڤە یا گرێدایە کو خوینا مرۆڤانە، وکانێ چ ژێ حەلالـە و چ حـەرامـە، وئەو ئاشکەرا دکـەت کو ئـەصل وبناخە د خوینێ دا ئـەوە حـەرامـە ئـەو بێتـە ڕێتن، وعەقل ژی بۆ ڤێ چەندێ دچت؛ چونکی ئـەو ل سـەر هندێ یێ هاتیـە دورستکرن، ئـەو حـەز دکـەت وێنـەیێ مرۆڤـی یـێ ب جوانترین ڕەنـگ هاتیـە ئافراندن، بمینت.

یەعنی: ئەڤ حەدیسا بۆری ب ڕەنگەکێ ئاشکەرا بۆ مە ددەتە دیارکرن، کو ڕێتنا خوینا مرۆڤێ موسلمان کارەکێ حەرامە، وپاراستنا رحێ ئێک ژ وان کارانە یێن ئیسلامێ ل سەر مە فەرکری، وئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە ئایەتێن قورئانا پیرۆز، هەر وەسا گۆتنێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دێ بینین کو خودێ وپێغەمبەرێ وی گەفێن دژوار ل وی کەسی کرینە یێ ژ قەستا وبێ حەق خوینا مرۆڤەکی بڕێژت، وئەو گەف ب گەلەک ڕەنگان بەرچاڤ دبت، ژ وان:

١- ئەو کەسێ مرۆڤەکی بکوژت، تاوانا وی هند یا مەزنە هەر وەکی وی خەلکێ عەردی هەمی کوشتین، خودێ دبێژت: ﴿ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾ (المائدة: ٣٢).

٢- ژ بەر تاوانا وی یا مەزن خودێ د ئایەتەکێ دا گەفێ ب چوونا جەهنەمێ، ومانا تێدا، وغەزەبا خودێ ولەعنەتا وی، وعەزابەکا مەزن، ل وی دکەت دەمێ دبێژت: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴿٩٣﴾ ﴾ (النساء: ٩٣).

٣- پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دگۆتنەکا خۆ دا یا بوخاری وموسلم ژێ ڤەدگوهێزن ئاشکەرا دکەت کو کوشتنا وێ نەفسێ یا خودێ کوشتنا وێ حەرام کری ئێک ژ حەفت گونەهانە یێن خودانی دبەنە هیلاکێ، ژ بەر مەزنیا وان.

٤- و د گۆتنەکا خۆ یا دی دا یا ترمذی ژێ ڤەدگوهێزت دبێژت: خراببوونا دنیایێ ل بەر خودێ سڤکترە ژ کوشتنا زەلامەکێ موسلمان.

بەلێ ئەڤ پاراستنا خوینێ هنگی ڕادبت ونامینت دەمێ خودان ئێک ژ وان کاران دکەت یێن خوین پێ حەلال دبت، ومسۆگەر ئەو کار هند دمەزن وکرێتن حەتا ئەڤ کارێ مەزن -کو کوشتنە- پێ حەلال دبت، و د ڤێ حەدیسا خۆ دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مە بەحسێ سێ ژ وان کاران دکەت یێن (عصمەتا خوینێ) ڕادکەت، وخودانی موستەحەقی کوشتنێ دکەت، وبەری ئەم

بەحسێ ڤان هەر سێ حالەتان بکەین، پێتڤیە ئاشکەرا بکەین کو ب جهئینانا حوکمی د ڤان حالەتان دا، کارێ دەستهەلاتێ ب تنێیە، وبۆ خەلکی نینە ئەو ژ نک خۆ ب کارێ جهئینانا (حدوودێن شەرعی) رابین.. وئەو هەر سێ حالەت ئەڤەنە:

١- ﴿ الثَّيِّبُ الزَّانِي ﴾ یەعنی: ئەو کەسێ ب کرنا فاحشێ رابیت، وئەگەر زەلام بت یێ ب ژن بت، وئەگەر ژن بت یا شویکری بت، زانایێن ئیسلامێ هەمی ل وێ باوەرێنە کو عقووبا ڤان رەنگە کەسان، پشتی تاوان ل سەر ئیسبات دبت (رەجمە) و د ریوایەتێن دورست دا هاتیە کو پێغەمبەری (ماعز وغامدیە) هەردو رەجماندینە.

وهەر چەندە رەجم عقووبەیەکا دژوارە ژی، بەلێ دەمێ مرۆڤ هزرا خۆ د تاوانا زنایێ دا دکەت، ودەمێ ئەو د ناڤ جڤاکەکێ دا بەلاڤ دبت، ووان خرابیێن جڤاکی وساخلەمی یێن ئەو دگەل خۆ دئینت، بۆ مرۆڤی ئاشکەرا دبت کو هندەک تاوان هەنە کوشتن ل بەر سڤک دبت.

٢- ﴿ وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ ﴾ یەعنی: ئەوێ مرۆڤەکی ژ قەستا وبێ حەق بکوژت، جزایێ وی ژی ئەوە ئەو بێتە کوشتن، ئەگەر هات ومرۆڤێن کوشتی کوژەکی عەفی نەکەن، خودێ د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ﴾ (المائدة: ٤٥).

٣- ﴿ وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ ﴾ یەعنی: ئەو کەسێ دینێ خۆ بهێلت و ل کوفرێ بزڤرت، وخۆ ژ جماعەتێ ڤەدەر کەت.

و ژ بلی ڤان هەر سێ کاران، هندەک کارێن دی ژی هەنە خودانی موستەحەقی کوشتنێ دکەن، د هندەک ئایەت وحەدیسێن دی دا هاتینە، وەکی: ب کارئینانا سێرەبەندیێ، یان کەسەک بێت عەردێ مرۆڤی ژێ بستینت، یان مال وناموسا وی بخوازت وتەعدایێ ل حەقێ وی بکەت، یان بەلاڤکرنا فەساد وخرابکاریێ د عەردی دا، یان ئەوێ رێزا موسلمانان

ژێکڤـەکـەت، یـان کـارێ قـەومـێ لـووطـی بکـەت، یـان ئێـک ژ ئـەرکـانێن ئیسلامێ عاطـل بکەت وەکی: نڤێژێ وحەجێ وزەکاتێ.. هتد.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- حەدیس هندێ دگەهینت کو خوینا مرۆڤـێ موسلمان یا پاراستیە، ونابت بێ حەق ئەو بێتە رێتن.

٢- حـەدیـس هنـدێ دگـەهینـت کـو هنـدەک تـاوان هـەنـە خـودانی هێـژای کوشتنێ دکەن، ژ بـەر کارتێکرنا وان یـا خراب ل سەر جڤاکێ، وەکی: کرنا فاحشێ ئەوا (ئەنسابێن خەلکی) پێ تێکەل دبن، وئێشێن جڤاکی وصحی یێن ب ترس پێ بەلاڤ دبن.

٣- وحەدیس هندێ دگەهینت کو نـەفس یـا ب بهایـە، ونابت بـۆ کـەسـێ نەفسەکێ بێ حەق و ژ تەعدایی بکوژت، وئەوێ ب ڤێ تاوانێ رابیت جزایێ وی ئەوە ئەو ژی بێتە کوشتن.

٤- وحـەدیـس گـرنگیا پاراستنا کۆما موسلمانان بۆ مـە ئاشـکەرا دکـەت ژ تاوانـا وان کـەسـان یـێن گومـانێ بـۆ خـەلکـی د دینـێ وان دا چـێ دکـەن، وئێکرێزیا وان تێک ددەن ودئێخنە ژێر ترسا پارچەبوونێ.

## حەدیسا پازدێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنـه-، قـال: رَسُـولُ الله -صـلى الله عليـه وسلم-: ﴿ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بالله وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَـصْمُتْ، وَمَـنْ كَـانَ يُؤْمِنُ بالله وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بالله وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ فَلْيُكْـرِمْ ضَيْفَهُ ﴾.

رواه مسلم

ئەبوو هورەیرە -خودێ ژێ رازی بت- ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەچیێ باوەری ب خودێ ورۆژا قیامەتێ هەبت بلا گۆتنا خێرێ بێژت یان خۆ بێ دەنگ بکەت، وهەچیێ باوەری ب خودێ ورۆژا قیامەتێ هەبت بلا قەدرێ جیرانێ خۆ بگرت، وهەچیێ باوەری ب خودێ ورۆژا قیامەتێ هەبت بلا قەدرێ مێڤانێ خۆ بگرت.

موسلم ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسا پیرۆز بەرێ مە ددەتە سێ ئەخلاقێن باش یێن کو تێکەلیا مە د گەل خەلکی تازە دکەن، ودبتە ئەگەرا بەلاڤبوونا ڤیان وحەژیکرنێ د ناڤبەرا خەلکی دا، وئەو هەسی ئەخلاق ژی ئەڤەنە:

**١- گرتنا ئەزمانی:**

پێغەمبەر -سلاڤ لی بن- دبێژت: ﴿ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بالله وَالْيَوْمِ الْآخِـرِ فَلْيَقُـلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ ﴾ ئیمامێ شافعی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: مەعنا ڤێ

حەدیسێ ئەوە ئەگەر مرۆڤەکی ڤیا باخڤت، بلا هزرا خۆ بکەت، ئەگەر وی دیت چو زیان ل سەر وی نینە بلا باخڤت، وئەگەر بۆ وی ئاشکەرا بوو کو زیانەک د گۆتنا وی دا هەیە، یان شک بۆ چێبوو کو بەلکی زیانەک هەبت بلا خۆ بێ دەنگ بکەت.

مەعنا: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا فەرمانێ ل مە دکەت، کو ئەم ئێک ژ دووان هلبژێرین: یان گۆتنا خێرێ بێژین، یان ژی نەئاخڤین، وئەڤە هندێ دگەهینت کو مرۆڤ بشێتە ئەزمانێ خۆ، ووی بەس بۆ وان گۆتنان ب کاربینت یێن مفا تێدا هەی.

### ٢- قەدرگرتنا جیرانی:

وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ ﴾ وقەدرگرتنا جیرانی هندێ دخوازت مرۆڤ وی تشتی نەکەت یێ نەخۆشی پێ بگەهتە جیرانی، وئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە ئایەتێن قورئانێ وحەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دێ بینین وان گەلەک شیرەت ب مەزنکرنا بهایێ جیرانی ل مە کرینە، بوخاری ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: جبریلی هند شیرەت ب جیرانی ل من کر حەتا من هزرکری کو ئەو دێ بتە میراتگرێ وی. و د حەدیسەکا دی دا یا بوخاری ژ ئەبوو شورەیحی ڤەدگوهێزت هاتیە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سێ جاران سویندا خوار وگۆت: ئەو کەس باوەریێ نائینت.. صەحابیان گۆت: کی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: ئەوێ جیرانێ وی ژ خرابیێن وی ئەمین نەبت.

### ٣- قەدرگرتنا مێڤانی:

﴿ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ ﴾ وئەڤە ژی هندێ دگەهینت کو قەدرگرتنا مێڤانی ژ باوەریا خودانیە، وئێک ژ وان عیبادەتانە یێن مرۆڤ خۆ پێ نێزیکی خودێ دکەت، و د حەدیسەکێ دا یا موسلم ژ پێغەمبەری

-سلاڤ لێ بن- ڤەدگوهێزت هاتیە كو مێڤانداری سێ رۆژن، ویا زێدەتر خێرەكە ئەو د گەل وی دكەت.

وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: هەچییێ باوەری ب خودێ ورۆژا قیامەتێ هەبت بلا هۆ بكەت.. مەعنا وێ ئەو نینە یێ ڤان كاران نەكەت باوەری نابت، بەلكی ئەو رەنگەكێ تەشجیعێیە بۆ مرۆڤی كو وان كاران بكەت، وەكی مرۆڤەك بێژتە كورێ خۆ: ئەگەر تو كورێ منی فلان تشی بكە.. دا ئەو وە بكەت.

و ژ لایەكێ كی ڤە حەدیس هندێ دگەهینت كو ئەڤ هەر سێ كارێن باش ژ پشكێن باوەریێنە، وباوەری نە بەس ب وان كاران ڤە یا گرێدایە یێن د ناڤبەرا مرۆڤی وخودێ دا هەین، بەلكی ئەو ب وان كاران ژی ڤە یا گرێدایە یێن د ناڤبەرا مرۆڤی وخەلكی ژی دا هەین، وپێتڤیە ئەم ب ڤێ فرەهییێ د باوەریێ بگەهین.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئیسلام وان ئەخلاقان ژ مە دخوازت یێن كو ڤیانێ د ناڤبەرا خەلكی دا بەلاڤ دكەن، وریێزێن وان پتر موكم دكەت.

٢- و ژ ڤێ حەدیسێ گرنگیا پەیڤێ وخەطەریا وێ بۆ مە ئاشكەرا دبت، ودبت پەیڤەكا ب تنێ ببتە ئەگەرا هندێ خودێ ژ مرۆڤی عێجز ببت، ودلێ خەلكی ژی ژ مرۆڤی بمینت.

٣- وحەدیس هندێ دگەهینت كو خودان باوەریێ دورست ئەوە یێ قەدرێ جیرانێ خۆ بگرت، هەر وەسا قەدرێ مێڤانێ خۆ ژی، وئەڤە ژ وان ئەخلاقێن باشە یێن ئیسلامێ بەرێ مە دایێ.

## حەدیسا شازدێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه-، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ -صلى الله عليه وسـلم-: أَوْصِنِي، قَالَ: ﴿ لَا تَغْضَبْ ﴾، فَرَدَّدَ مِرَارًا، قَالَ: ﴿ لَا تَغْضَبْ ﴾.

**رواه البخاري**

ئەبوو هورەیرە -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: زەلامەكی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: شیرەتەكێ ل من بكە، وی گۆتێ: كەربێن خۆ ڤەنەكە، ووی چەند جارەكان گۆتنا خۆ دوبارە كر، وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر گۆتێ: كەربێن خۆ ڤەنەكە.

بوخاری ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە ئێک ژ حەدیسێن مەزنە، یێن كو بەرێ مە ددەتە ئێک ژ وان ئەخلاقان یێن خێرا دنیایێ وئاخرەتێ ب دەست مرۆڤی ڤە دئینن، چونكی ئەو فەرمانێ ل مە دكەت كو ئەم خۆ ژ وان ئەگەران بدەینە پاش یێن كەربێ ل نک مە پەیدا دكەن، ومە ل هندێ ئاگەهدار دكەت كو خێر هەمی ئەوە مرۆڤ كەربێن خۆ ڤەنەكەن.

د ڤێ حەدیسێ دا هەڤالێ پێغەمبەری یێ نێزیک ئەبوو هورەیرە -خودێ ژێ رازی بت- بۆ مە ئاشكەرا دكەت كو مرۆڤەكی (و د هندەک ریوایەتان دا هاتیە كو ئەو ئەبوو دەرداء بوو) داخواز ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كر كو ئەو شیرەتەكا كۆمكەر وكورت ل وی بكەت، دا بشێت ژ بەر بكەت وكاری پێ بكەت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: كەربێن خۆ ڤەنەكە. وسێ

جاران ڤی مرۆڤی داخوازا خۆ دوباره کر، وهەر سێ جاران پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەر ئەو شیرەت گۆتێ.. تشتێ هندێ دگەهینت کو خۆدویرکرنا مرۆڤی ژ کەربێ وئەگەرێن پەیداکرنا وێ سەری هەر باشیەکێیە.

وکەرب ڤەبوون حالەتەکە دکەفتە بەرانبەر رازیبوونێ، وهندەک کەسێن بسپۆر کەرب ڤەبوونێ ددەنە نیاسین ودبێژن: کەرب ڤەبوون کەلینەکە د دلی دا پەیدا دبت خودانی پال ددەت کو تۆلێ ژ وی کەسی بستینت یێ نەخۆشیەک گەهاندیێ، وئەڤ حالەتە گەلەک جاران بەرێ خودانی ددەتە هندێ کو ئەو کارەکی یان گۆتنەکا نەدورست بکەت، وبەر ب حەرامییێ ڤە بچت، ژ بەر هندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- شیرەت ل ڤی صەحابییێ خۆ کر، و د رێکا وی را ل مە هەمییان ژی کر کو ئەم خۆ ئەگەرێن کەربێ بدەینە پاش، وئەگەر هات جارەکێ کەربێن ئێک ژ مە ڤەبوون ژی، ئەم بشێینە خۆ وکەربا خۆ داکەین، دا تووشی خرابییێ نەبین.

وهەژیە بێژین: دو رەنگێن کەرب ڤەبوونێ هەنە، ئێک یا باشە، وئێک یا خرابە، ومەخسەد ب کەرب ڤەبوونا باش ئەوە یا بۆ خودێ بت، دەمێ مرۆڤ ببینت کارەکێ خودێ پێ نەخۆش یێ دئێتەکرن، وکەس نینە وی مەنعە کەت یان خەلکی ژێ بدەتە پاش، و د حەدیسێن دورست دا هاتیە کو ئەو کەسێ کەربێن وی ڤەببن دەمێ دبینت بێ ئەمرێ خودێ یا دئێتەکرن، رۆژا قیامەتێ ئەو دێ ژ وان بت یێن خودێ ددەتە بەر سیبەرا خۆ، بەلێ د ڤان دەمان ژی دا بۆ وی چێ نابت ئەو تشتەکی بکەت یێ خودێ فەرمان پێ نەکری.

ورەنگێ دووێ یێ کەرب ڤەبوونێ ئەو رەنگە یێ نەدورست، کو سەرا تشتێن دنیایێ بت، وچارەسەریا ڤی رەنگێ کەربێ ب گەلەک رێکان دبت، وەکی:

١- دوعاکرن ژ خودێ کو ئەو مرۆڤی بپارێزت، وبکەتە ژ وان یێن خۆ ژ بیر نەکەن نە ل دەمێ رازیبوونێ ونە ل دەمێ کەرب ڤەبوونێ.

٢- مرۆڤ خۆ ژ زکرێ خودێ دویر نەکەت، هەردەم قورئانێ بخوینت، وئستغفاران بکێشت.

٣- بیرا خۆ ل وان ئایەت وحەدیسان بینتەڤە یێن بەرێ وی ژ کەربێ ددەنە پاش، وخێرەکا مەزن بۆ وی کەسی دەسنیشان دکەن یێ ل دەمێ کەرب ڤەبوونێ بشێتە خۆ.

٤- گۆتنا (ئستعاذێ) ب تایبەتی ل وان دەمێن هەست بکەت کو کەربێن وی دێ ڤەبوون، وئستعاذە ئەوە بێژت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

٥- حالێ خۆ بگوهۆرت، ئەگەر یێ ژ پییان ڤە بت، بروینت، یان خۆ درێژ بکەت، وەکی د حەدیسەکێ دا هاتی.

٦- مرۆڤ خۆ ژ وان ئەگەران بدەتە پاش یێن کەربێن مرۆڤی ڤەدکەت، وەکی کێم نڤستنێ، یان کێم خوارنێ، وگەلەک وەستیانێ.. وهتد.

و د شەریعەتی دا هاتیە ئاشکەراکرن کو گەلەک ژ وان تەصەرروف وکارێن ئەو مرۆڤ دکەت یێن کەربێن وی ڤەبووین، ل سەر وی حسێب دبن، و د دنیایێ وئاخرەتێ ژی دا ئەو سەرا وان دێ ئێتە جزادان، وەکی وی یێ ل دەمێ کەرب ڤەبوونێ مالێ کەسەکی بتەلێفت، یان ئێکی بکوژت، ئەوی چو عوزر نابت، وهندەک کارێن دی هەنە ل سەر وی حسێب نابن، وەکی وی یێ دەمێ کەربەکا مەزن بۆ چێ دبت وطەلاقێن خۆ بهاڤێت، ئەڤە ل سەر گۆتنا هندەک فقهزانان.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە قەدر وبهایێ صەحابییان بۆ مە بەرچاڤ دکەت، وکو وان هەردەم پسیارا وان تشتان بۆ خۆ ژ پێغەمبەری دکر یێن مفایێ وان وخێرا دین ودنیایا وان تێدا هەی.

٢- وئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو ئەگەر تشتەکێ گرنگ هەبت، دڤێت مرۆڤ پتر ژ جارەکێ دوبارە بکەت، دا ئەو کەسێ گوهـ لێ دبت مفایی بۆ خۆ ژێ ببینت.

٣- کەرب ڤەبوون ئێک ژ وان حالەتێن خرابە یێن پێتڤیە مرۆڤ ژ خۆ بدەتە پاش وخۆ ژێ دویر بکەت، ژ بەر وان ئەنجامێن نەباش یێن د دویڤ دا دئێن.

## حەدیسا هەڤدێ

عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ -رضي الله عنه-، عَنْ رَسُولِ الله -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: ﴿ إِنَّ الله كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ ﴾.

رواه مسلم

شەددادێ كورێ ئەوسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: خودێ قەنجی ل سەر هەر تشتەكی واجب كریە، ڤێجا ئەگەر هەوە كوشتن كر، وێ ب قەنجی بكەن، وئەگەر هەوە ڤەكوشتن كر، وێ ب قەنجی بكەن، وئێك ژ هەوە بلا كێرا خۆ سەقا كەت، وڤەكوشتییێ خۆ رحەت بكەت.

موسلم ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە ژی وەكی یێن بەری خۆ ئێك ژ قاعیدە وپێپكێن ئیسلامێ یێن سەرەكی بۆ مە بەرچاڤ دكەت، كو ب كارئینانا قەنجییێ د هەمی تشتان دا، و ژ حەدیسێ ئاشكەرا دبت كو قەنجی و ب كارئینانا وێ د هەمی گۆتن وكریاران دا تشتەكێ واجبە ل سەر هەمی چێكریان.

وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: ﴿ إِنَّ الله كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ ﴾ خودێ (ئیحسان) ل سەر هەمی تشتان (نڤیسیە). ژێ دئێتە زانین كو حوكمێ (ئیحسانێ) ووجووبە، چونكی د قورئان وحەدیسان دا پەیڤا (نڤیسین) بۆ كارێ واجب دئێتە گۆتن، وەكی د ئایەتەكێ دا هاتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ ووەكى ئاشكەرا حوكمێ رۆژيێ ووجووبە.

و د قورئـانێ ژى دا خـودێ (ئيحسـان) ل سـەر مـە واجب كريـە، وەكـى گۆتى: ﴿ وَأَحْسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾ (البقرة: ١٩٥) و د ئايەتەكا دى دا دبێژت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ﴾ (النحل: ٩٠).

و(ئيحسـان) د زمـانێ عـەرەبـان دا ژێـدرێ (أحـسن، يحـسن)يێيـە، ومەبەست پێ گەهاندنا قەنجى ومفايە بۆ خەلكى، دبێژن: (فلان أحسن إلـى فلان) يەعنى: فلانى ئەو تشت گەهاندە فلانى يێ قـەنجى وباشيا وى تێدا هەى، و (ئيحسانا د كارى دا) ئەوە دەمێ مرۆڤ كـارەكى دكـەت، وى كـارى ب رەنگەكێ تمام وپێكهاتى بكەت، ونەهێلت چو كێماسى بكەڤنێ.

پێغـەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- د ڤـێ گۆتنـا خـۆ دا رادگـەهينـت، كـو خـودێ قـەنجى د هـەمـى تـشتان دا نڤيسيە، ومـەخسەد ب هـەمـى تـشتان ل ڤێرێ ئەوگۆتن وكريارن يێن مرۆڤێ (موكەللەف) پێ رادبت، دەمێ مرۆڤ گۆتنەكێ يان كريارەكا باش دكەت دڤێت ئحسانێ تێدا ب كار بينت، يەعنـى: ئـەو وى ب تمامى بكەت، وەكى مە گۆتى، ودەمێ ئەو خۆ ژ گـۆتن وكريـارەكا حـەرام ددەت باش، دڤێت ئحسانێ تێدا بكـەت، يـەعنـى: ب تمـامى خـۆ ژێ بـدەتـە پاش، ودەمـێ رابـەرى قەدەرا خودێ دبت دڤێت ئحسانێ بكـەت، كـو صـەبرێ ل سەر بكەت، ودەمێ تێكەليێ د گەل خەلكى دكەت، دڤێت ئحسانێ د گەل وان ب كار بينت، يەعنى: حەقێ وان يێ خودێ دايێ، ژ سـەر خـۆ راكـەت، و ب دورستى ب واجبێ خۆرابيت.. وهۆسا، پێتڤيـە ل سـەر وى ئـەو د هـەمـى گۆتن وكرياران دا قەنجى وئيحسانێ ب كار بينت.

وپشتى بنەجهكرنا ڤى قاعيدەيێ گشتى، پێغـەمبـەرى -سـلاڤ لـێ بـن- دو نموونە ل سـەر قـەنجيـێ بـۆ مـە ئينـان، ب دو كـارێن وەسـا يـێن چـو هزرا قەنجيێ تێدا نائێتـە كـرن، چـونكى ئـەو هـەردو كـاران كلۆڤانكا بـێ رەحمـى ودلرەقييێيە، كو (كوشتن) و (ڤەكوشتنە).

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ ﴾ ومەخسەد ب کوشتنێ ل ڤێرێ، کوشتنا وێ نەفسێیە یا خودێ کوشتنا وێ حەلال کری، وەکی وی کەسی یێ مرۆڤەکی بێ حەق بکوژت، ڤێجا حوکم ب کوشتنا وی ژی بێتەدان.. دەمێ ئەو قاتل دئێتە کوشتن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: قەنجییێ د کوشتنا وی دا بکەن!

یەعنی: چ؟

یەعنی: وی ب عەزاب نەکوژن، وپشتی هوین وی دکوژن یاریان بۆ خۆ ب کەلەخێ وی نەکەن، وێ رێکێ د کوشتنا وی دا ب کاربینن یا رحا وی زوی پێ دەرکەڤت، وبێی ئەو بێتە عەزابدان، وەکی سۆتنێ، یان خندقاندنێ، یان ژێڤەکرنا ئەندامێن لەشێ وی ب ساخی.. وهتد.

نموونەیێ دووی: ڤەکوشتنا حەیوانەتی ﴿ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ ﴾ یەعنی: دەمێ ئێک ژ هەوە حەیوانەکی ڤەکوژت، بلا د کریارا ڤەکوشتنێ دا قەنجییێ ب کار بینت، وقەنجیا د ڤەکوشتنێ دا ئەوە ئەو وان شەرتان ب کار بینت یێن شریعەت پێ هاتی، وەکی:

١- دڤێت ئەو ئامیرەتێ ئەو ب ڤەکوشتنێ ب کار دئینت یێ خۆش وسەقاکری بت؛ دا حەیوان نەخۆشیەکا زێدەتر نەبینت، وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی: ﴿ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ ﴾.

٢- وبلا ئەو ل پێش چاڤێن حەیوانی کێرا خۆ نەهوسیت، ئیمامێ طەبەرانی ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: جارەکێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د بەر مرۆڤەکی رِا بۆری، وی پەزەک ل عەردی رازاندبوو، وکێرا خۆ دهوسی؛ دا سەرژێکەت، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بۆچی بەری هنگی تە وە نەدکر، ما تە دڤێت چەند جاران وێ ڤەکوژی؟

٣- بلا وان رەهێن کو دڤێت بێنە برین، ئەو ب ئێک جار ببرت، نە کو ئێک ئێکە.

٤- چێ نابت ئەوتشتەکی ژ لەشێ حەیوانی ببرت، بەری ڤەکوشتنێ؛ چونکی ڤێ تەعزیبا وێ د ڤێ چەندێ دا هەیە.

و ژ ڤێ چەندێ دئێتە زانین کو حەتا حەیوانی دڤێت مرۆڤ رەحمێ پێ ببەت، د حەدیسەکێ دا یا ئیمام ئەحمەد ڤەدگوهێزت، هاتیە: ﴿ وَالشَّاةُ إِنْ رَحِمْتَهَا رَحِمَكَ الله ﴾ یەعنی: ئەگەر تو رەحمێ ب بزنێ ببەی، خودێ ژی دێ رەحمێ ب تە بەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو قەنجی د هەمی گۆتن وکریاران دا کارەکێ واجبە.

٢- هەر وەسا ئەو هندێ دگەهینت کو کوشتنا مرۆڤان ب عەزاب، ویاریکرنا ب کەلەخێ کوشتی کارەکێ حەرامە.

٣- وحەدیس هندێ ژی دگەهینت کو رەحم برنا ب حەیوانی، خۆ د دەمێ ڤەکوشتنا وی ژی دا کارەکێ واجبە، وئیسلامێ بەرێ مە پێ دایێ.

عَنْ أَبِي ذَرٍّ جُنْدُبِ بنِ جُنـادَةَ، وَأَبي عبـدِ الـرحمنِ مُعـاذِ بـنِ جَبَـلٍ -رضي الله عنهما-، عَنْ رَسُولِ الله -صلى الله عليه وسلم- قَالَ: ﴿ اتَّقِ الله حَيْثُمَا كُنْتَ ، وَأَتْبِـعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا ، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ ﴾.

رواه الترمذي

ژ ئـەبوو ذەرری وموعـاذێ کـورێ جـەبـەلـی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتـە ڤەگوهاستن، دبێژن: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هـەر جهـەکێ تـو لـێ بی تـەقوایـا خودێ بکـە، و د دویڤ گونـەهێ دا خێـرێ بکـە ئـەو دێ وێ ژێ بەت، و ب رەوشتەکێ باش تێکەلیا خەلکی بکە.

ترمذی ڤەدگوهێزت

گرنگیا ڤێ حەدیسێ ژ هندێ دئێت ئەو شیرەتێ ب سێ تشتێن گرنـگ ل مە دکەت:

یێ ئێکێ: تەقوایا خودێیە، کو بناخەیێ هەر قـەنجی وباشیـەکێیـە، وئـەو شیرەتە یا خودێ ل مە ویێن بەری مـە ژێ کری، وەکی د ئایـەتـەکا پیـرۆز دا هاتی: ﴿ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ (النساء: ١٣١) یەعنی: مە شیرەت ل وان یێن بـەری هـەوە کیتـاب بـۆ هـاتی کرییـە، وهەوە ژی کو تەقوایا خودێ بکەن. وپێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- هەر جار ل دەسپێکا خوتبێن خۆ بیرا صەحابییێن خۆ ل تەقوایێ دئینا ڤە، وشیرەت پێ ل وان دکر.

يێ دووێ: مرۆڤ وی تشتی بکەت یێ گونەهـ پێ دئێنە ژێبرن، کو کرنا باشییێیە پشتی هەر گونەهەکێ.

یێ سییێ: کو ئەم رەوشت وئەخلاقەکێ باش ل نک خۆ پەیدا بکەین، وتێکەلیا مە د گەل خەلکی یا تازە بت.

وتەقوا، کو شیرەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا ئێکێیە، مەعنا وێ د زمانی دا پەرژانە، یەعنی: مرۆڤ پەردەیەکی بێختە د ناڤبەرا خۆ ووی تشتی دا یێ ئەو ژێ دترست، ووی پێ نەخۆش بت، وتەقوا د زاراڤێ شەرعی دا ئەوە: عەبد پەرژانەکی بێختە ناڤبەرا خۆ ووی تشتی یێ ئەو ژێ دترست ژ غەزەب وعەزابا خودایێ خۆ، کو وی کاری بکەت یێ خودێ فەرمان ب کرنا وی لێ کری، وخۆ ژ وی کاری ژی بدەتە پاش یێ خودێ ئەو ژێ دایە پاش. و ژ ئەڤێ بۆری دئێتە زانین کو کرنا کارێن واجب، وخۆدویرکرنا ژ کارێن حەرام ژ تەقواییێیە، وتماميا تەقوایێ ب هندێیە مرۆڤ کارێن سوننەت ژی بکەت، وخۆ ژ کارێن مەکرووهـ بدەتە پاش.

وتەقوایێ گەلەک بەرهەمێن باش پێڤە دئێن، ژ وان: تەقوا ڤیانا خودێ ب دەست خودانی ڤە دئینت ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ (آل عمران: ٧٦)، ئەو کەسێ ب تەقوا بت خودێ کارێ وی ب ساناهی دئێخت ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ۝ ﴾ (الطلاق: ٧٦)، وئەوێ ب تەقوا بت ل ئاخرەتێ ژی جهێ وی بەحەشتە ﴿ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ۝ ﴾ (مریم: ٦٣). ودەمێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: هەچی جهێ تو لێ بی تەقوایا خودێ بکە، مەخسەد پتر پێ ئەوە دەمێ تو یێ ب تنێ بی وکەس تە نەبینت ژی، تو بیرا خۆ ل هندێ بینەڤە کو خودێ یێ تە دبینت، وئەو یێ نێزیکی تەیە، ودێ حسێبێ د گەل تە کەت، وکەس ژ وی مرۆڤی بێ عەقلتر نینە یێ کارێ خۆیێپاک نیشا خەلکی ددەت، وئەو چو مفایی وچو زیانێ ناگەهیننە وی، وکارێ خۆ یێ خراب نیشا خودێ ددەت، وئەوە یێ کو دێ حسێبەکا هویر د گەل وی کەت.

ئەبوو دەرداء دبێژت: ئێک ژ هەوە بلا خۆ ژ هندێ بپارێزت کو دلێن خودان باوەران لەعنەتان ل وی بکەن بێی ئەو پێ بحەسییێت، گاڤا دمینتە ب تنێ بێ ئەمریا خودێ بکەت، ڤێجا خودێ نەڤیانا وی بهاڤێتە دلێن خودان باوەران.

وئیمامێ شافعی -خودێ ژێ رازی- بت دبێژت: سێ تشت هەنە گەلەک دکێمن: مەردینی دەمێ مرۆڤی کێم هەبت، وتەقوا دەمێ مرۆڤ یێ ب تنێ بت، وگۆتنا حەقییێ ل نک وی مرۆڤ ژێ بترست وییێ ژێ ب هیڤی بت.

وچونکی مرۆڤ یێ (مەعصووم) نینە، ودبت هندەک جاران سست ببت، وبەر ب گونەهێ ڤە بچت، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرێ وی دا ئێک ژ وان کاران یێن بنە ئەگەرا ژێبرنا گونەهان، وگۆت: ئەگەر جارەکێ تە گونەهەک کر، ئێکسەر د دویڤ دا خێرەکێ بکە؛ دا ئەو وێ گونەهێ ژێ ببەت.. وخودایێ مەزن ژی د ئایەتەکێ ئاشکەرا دکەت کو خێر گونەهان ژێ دبەن، وەکی گۆتی: ﴿ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ (هود: ١١٤)، ودڤێت ژ بیر نەکەین کو (تەوبە) ب خۆ ژی ئێک ژ مەزنترین خێرانە، لەو هندەک زانا دبێژن: مەخسەد ب خێرێ ل ڤێرێ تۆبەیە ب رەنگەکێ تایبەت، چونکی تۆبە باشترین کارە گونەهێ ژێ دبەت. وهندەک زانا -وەکی عەطائی- دبێژن: کارێن باش ب تنێ گونەهێن بچویک ژێ دبەن، بەلێ گونەهێن مەزن هەوجەیی ب تۆبەیەکا تایبەت هەیە.

و د شیرەتا خۆ یا سییێ دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەرێ مە ددەتە ئەخلاقێ باش ب تایبەتی دەمێ ئەم سەرەدەریێ د گەل خەلکی دکەین، وپێغەمبەر سلاڤ لێ بن د هندەک حەدیسێن خۆ یێن دی دا رادگەهینت کو مرۆڤێ ژ هەمیان پتر باوەریەکا تمام هەی، ئەوە یێ ئەخلاقەکێ باشتر ل نک هەبت، هەر وەسا ئاشکەرا دکەت کو تشتێ ژ هەمیان پتر خودانی دبەتە بەحەشتێ تەقوا وئەخلاقێ باشە.

و ژ ئیمام ئەحمەدی دئێتە ڤەگوهاستن کو ئەخلاقێ باش ئەوە: دەمێ مرۆڤ تێکەلییێ د گەل خەلکی دکەت کەربێن خۆ ڤەنەکەت، وکینا وان نەکەتە دلێ خۆ.. یەعنی: ب دلەکێ صافی، ورویەکێ ڤەکری، سەرەدەرییێ د گەل وان بکەت، هاریکاریا وان د باشییێ دا بکەت، ونەخۆشییێ نەگەهینتە وان.

وتشتێ بەرچاڤ د حەدیسێ دا ئەوە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دەمێ بەحسێ ئەخلاقێ باش دکەت دبێژت: ﴿ وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ ﴾ ووەکی هوین دبینن ئەو دبێژت: ﴿ النَّاسَ ﴾ ونا بێژت: ﴿ المؤمنين ﴾ یان ﴿ المسلمين ﴾ تشتێ هندێ دگەهینت کو پێتڤیە مرۆڤ خودان ئەخلاقەکێ باش بت د گەل هەمی مرۆڤان.

وحەتا مرۆڤ ببتە خودان ئەخلاقەکێ باش دڤێت چاڤ ل پێغەمبەری بکەت د ئەخلاقێ وی دا؛ چونکی ئەخلاقێ وی مەزنترین وباشترین ئەخلاق بوو، وەکی خودێ دبێژتێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝ ﴾ (القلم: ٤)، هەر وەسا دڤێت ئەو هەڤالینیا وان مرۆڤان ژی بکەت یێن ئەخلاقەکێ باش هەی؛ چونکی هەڤال چاڤ ل هەڤالی دکەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ حەدیسێ دا شیرەتێ ب سێ تشتان ل مە دکەت:

١- کو ئەم تەقوایا خودێ بکەین، ل هەمی جهان، چ خەلک مە ببینن یان نە.

٢- کو ئەم د دویڤ هەر گونەهەکێ دا تۆبە بکەین، وقەستا کارێن چاک بکەین.

٣- کو ئەخلاقێ مە د گەل خەلکی هەمییێ ئەخلاقەکێ باش بت.

## حەدیسا نۆزدێ

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ -رضي الله عنه-، قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ الله -صلى الله عليه وسلم- يَوْمًا فَقَالَ: ﴿ يَا غُلاَمُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ الله يَحْفَظْكَ، احْفَظِ الله تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ الله، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بالله، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ الله لَكَ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ الله عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ ﴾. رواه الترمذي، وقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

وفي رواية غير الترمذي: ﴿ احْفَظِ الله تَجِدْهُ أَمَامَكَ، تَعَرَّفْ إِلَيْهِ فِي الرَّخَاءِ، يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ أَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَأَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴾.

ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: رۆژەکێ ئەز ل پشت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بووم، وی گۆت: خۆرتۆ! ئەز دێ هندەک گۆتنان نیشا تە دەم، تو خودێ بپارێزە ئەو ژی دێ تە پارێزت، خودێ بپارێزە دێ وی ل بەرا خۆ بینی، ئەگەر تە پسیارەک هەبت پسیارا خۆ ژ خودێ بکە، وئەگەر تە داخوازا هاریکارییێ کر وێ ژ خودێ بخوازە، وتو بزانە ئەگەر ئوممەت کۆم ببت دا ب تشتەکی مفایی بگەهیننە تە ئەو ب تشتەکی مفایی ناگەهیننە تە ب وی تشتی نەبت یێ خودێ بۆ تە نڤیسی، وئەگەر ئەو کۆم ببت دا زیانەکێ بگەهیننە تە ئەو نەشێن زیانێ ب تشتەکی بگەهیننە تە ب وی تشتی نەبت یێ خودێ ل سەر تە نڤیسی،

قەلەم هاتنە راكرن وكاغەز هشك بوون. ترمذی ڤەدگوهێزت، ودبێژت: حەدیسەكا دورستە، و د ریوایەتەكا دی دا نە ل نك ترمذی هاتیە: خودێ بپارێزە دێ وی ل بەرا خۆ بینی، ل بەرفرەهییێ خودێ بنیاسە ل تەنگاڤییێ ئەو دێ تە نیاست، وتو بزانە كو ئەو تشتێ نەگەهشتیە تە نەدبوو بگەهتە تە، وئەوێ گەهشتیە تە نەدبوو نەگەهتە تە، وتو بزانە كو سەركەفتن د گەل بێنفرەهییێیە، وفرەهی د گەل تەنگاڤییێیە، و د گەل نەخۆشییێ خۆشی هەیە.

ئەڤە ئێك ژ وان حەدیسێن مەزنە یێن پێپكێن سەرەكی یێن دینی، وشیرەتێن مەزن د ناڤ خۆ دا هل دگرت، وئەگەر مرۆڤ هزارا خۆ تێدا بكەت دێ بینت هژمارەكا دەرسێن گرنگ تێدا هەنە، ژ وان:

**خودێ بپارێزە، ئەو دێ تە پارێزت:**

وپاراستنا مرۆڤی بۆ خودێ ب هندێ دبت كو مرۆڤ دینێ وی بپارێزت، ئەمر ونەهیێن وی ب جهـ بینت، وپێ ل توخوبێن وی نەدانت، ئەو كەسێ ڤێ چەندێ بكەت، خودێ دێ وی پارێزت، وەكی د ئایەتەكێ دا خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴾ (محمد: ٧) گەلی خودان باوەران، ئەگەر هوین خودێ ب سەربێخن، ئەو ژی دێ هەوە ب سەرئێخت، ودێ پیێن هەوە موكم كەت.

**خودێ بپارێزە، ئەو دێ د گەل تە بت:**

وئەو كەسێ دینێ خودێ بپارێزت، وپێ ل توخوبێن وی نەدانت، خودێ قەنجیەكا دی ژی د گەل وی دكەت، ئەو ژی ئەڤەیە: خودێ هەر دەم دێ د گەل وی بت، وئەوێ خودێ د گەل وی بت، تەوفیق وسەركەفتن وپاراستن دێ بارا وی بت، وئەوێ خودێ د گەل وی بت چو جاران خەم وخەریبی وبێ خودانی بارا وی نابت. هەر وەسا ئەو كەسێ شعوور بكەت كو خودێ هەردەم یێ د گەل وی شەرما وی ژ خودێ دێ وی ژ هندێ دەتە پاش كو ئەو بێ ئەمریا خودێ بكەت.

**دوعا وپسیار ژ خودێ ب تنێیه:**

وئەڤە ئێک ژ بنگەهێن سەرەکییە د عەقیدا ئیسلامی دا، دوعا کاکلکا عیبادەتییە، وعیبادەت بۆ خودێ ب تنێ ب ئێتەکرن، وهەر پێغەمبەرەکێ هاتی بەری هەر تشتەکی داخواز ژ مللەتێ خۆ کریە ئەو عیبادەتێ خودێ ب تنێ بکەن، خودایێ مەزن د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ۝ ﴾ (الأحقاف: ٥) کەس ژ وی سەرداچووی وڕێبەرزەتر نینە یێ ژ بلی خودێ دوعایێ ژ ئێکێ دی بکەت، ئەو ئێکێ قەت وقەت د بەرسڤا وی نەئێت حەتا ڕۆژا قیامەتێ، وئەو ژ گازیا وی یێ غافل وبێ ئاگەهـ.. ئەڤە د وان تشتان دا یێن مرۆڤ نەشێن بکەن، وخواستنا وان تشتان ژ مرۆڤان یێن ئەو دشێن بکەن، گەلەک زانا ل وێ باوەرێنە کو ئەو ژی یا مەکرووهە، و ژ هندەک صەحابیان هاتیە ڤەگوهاستن کو وان بەیعە دابوو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو ئەو خواستنا چو تشتان ژ کەسێ نەکەن، لەو ئێک ژ وان دەمێ شفکا وی، یان هەڤسارێ دەوارا وی دکەت، وی داخواز ژ کەسێ نەدکر بێت وی بدەتەڤێ!

**وخواستنا هاریکاریێ ژی:**

ژ خودێ ب تنێ دئێتەکرن، وتشتەکێ ئاشکەرایە کو ئەم د هەمی نڤێژێن خۆ دا، د سوورەتا (الفاتحة) دا دبێژین: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝ ﴾ (الفاتحة: ٥) وئەڤە ئعترافەکە ژ مە کو ئەم عیبادەتێ خودێ ب تنێ دکەین، وداخوازا هاریکاریێ ژ وی ب تنێ دکەین.

**باوەریا ب قەدەرا خودێ:**

و د ڤێ گۆتنا خۆ دا پێغەمبەر سلاڤ لێ بن بەرێ مە ددەتە باوەری ئینانا ب قەدەرا خودێ ژی، دەمێ مە ل هندێ هشیار دکەت کو ئەگەر خەلک هەمی بێن نەشێن وی تشتی بگوهۆڕن یێ قەلەمێ قودرەتێ پێ هاتیە گێڕان، وپێتڤیە مرۆڤی باوەریەکا باوەری هەبت کو هەر تشتەکێ بێتە سەری یێ

خۆش بت یان پێ نەخۆش بت، علمێ خودێ پێ هەبوویە بەری چێ ببت، وقەدەرا وی ژی پێ گەڕیایە بەری ببت، بەلێ دڤێت کەسەک ب ڕەنگەکێ سلبی د قەدەرێ نەگەهت، ودەستان بەرنەدەت، وهەر واقعەکێ هەبت پێ رازی ببت ب هێجەتا هندێ کو مانێ قەدەرا خودێ ب ڤی تشتی هەیە، ڤێجا هەما دڤێت ئەو پێ رازی بت.. نە! دەمێ صەحابیەکی گۆتیە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: ما دەم کارێ ئەم دکەین بەری هنگی هاتیە نڤیسین، ما کار بۆچیە؟ وی گۆت: نە.. کاری بکەن، چونکی بەرێ هەر ئێکی دێ بۆ وی کاری ئێتەدان یێ ئەو ئەو هاتیە چێکرن.

**ئەگەر تە بڤێت خودێ د هەوارا تە بێت:**

و ژ وان دەرس وحکمەتێن مەزن یێن ژ ڤێ حەدیسێ دئێنە وەرگرتن، ئەڤەیە: ئەگەر تە بڤێت خودێ د تەنگاڤیێ دا د هەوارا تەبێت، وئەو تە ژ نەخۆشیێ رزگار بکەت، ل بەرفرەهیێ وی بنیاسە، دەمێ تو یێ ساخلەم، یێ دەولەمەند، د بەرفرەهی وتەناهیێ دا دژی، هێز وشیان تە هەی، تو خۆ ژ وی بێ منەت نەکە، هەوجەییا خۆ بۆ وی ئاشکەرا بکە، و د ئەمرێ وی دا بە، وی بنیاسە، دا ل وی دەمێ تو هەوجەیی وی دبی، ئەو تە ژ بیر نەکەت، و د هەوارا تە بێت.

ئەبوو هورەیرە دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيبَ الله لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالكَرْبِ، فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ ﴾ یەعنی: هەچیێ پێ خۆش بت ل دەمێ تەنگاڤیێ خودێ د بەرسڤا وی بێت، بلا ل بەرفرەهیێ گەلەک دوعایان بکەت. وەکی ترمذی ژێ ڤەدگوهێزت.

**د گەل نەخۆشیێ خۆشیە:**

دەمێ تەنگاڤی ونەخۆشی ب سەر مرۆڤی دا دئێن، دڤێت ئەو قەت بێ هیڤی نەبت، وصەبرا خۆ ژ دەست نەدەت، د دەنیایێ دا مرۆڤ د هەمی حالەتان ڕا دبۆرت، ودبت گەلەک ڕەنگێن نەخۆشیێ ب سەر وی دا بێن،

ڤێجا دەمێ نەخۆشیەک دگەهتێ، یان تەنگاڤیەک ب سەر دا دئێت، دڤێت وی باوەری هەبت کو ژ بەر حکمەتەکێ خودێ ئەڤ چەندە یا ئینایە رێکا وی، لەو دڤێت ئەو صەبرێ بکێشت، وحەمدا خودێ بکەت، و ل بیرا خۆ بینت، کو پشتی هەر نەخۆشیەکێ خۆشیەک هەیە، وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت کو نەخۆشی هەر یا بەردەوام بت، هەر دەمەک دێ ئێت ئەو نامینت، ڤێجا ئەگەر تە بڤێت دەست ڤالا ژ وێ نەخۆشیێ دەرنەکەڤی، صەبرێ بکێشە، وبۆ خۆ ب خێر حسێب بکە، وهەوارێن خۆ بگەهینە خودێ کو ئەو وێ نەخۆشیێ ژ سەر تە لابدەت، وکاری بۆ ڕاکرنا وێ نەخۆشیێ بکە ئەگەر ئەو چەندە د شیانا تە دا بت.

**مفایێن حەدیسێ:**

هژمارەکا دەرسێن گرنگ ژ ڤێ حەدیسێ دئێنە وەرگرتن، وەکی:

١- دڤێت هەر ژ بچویکاتی ئەم عەقیدە وبیر وباوەرێن دورست نیشا زارۆکان بدەین، ووان فێری وی تشتی بکەین یێ ئەو مفایی بۆ خۆ ژێ ببینن د ژیانا خۆ دا.

٢- سەیدا دڤێت هەمی دەمان ئیستغلال بکەت وتشتێ ب مفا بۆ شاگردێ خۆ بێژت، ئەڤە هندەک شیرەت بوون پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل زارۆکەکی کرین دەمێ ئەو دسویار و ژ جهەکی دچوونە جهەکێ دی.

٣- ئەگەر ئەم ژ زارۆکینی بچویکی تێ بگەهینین کو مفا وزیان، خۆشی ونەخۆشی د دەستێ خودێ ب تنێ دانە، ودڤێت مرۆڤ هەوارێن خۆ بەس بگەهینتە وی، و ژ وی ب تنێ یێ ب هیڤی بت، دەمێ ئەو مەزن دبت، ئەو دێ بتە مرۆڤەکێ زیرەک، یێ ژ خودێ ب تنێ دترست.

٤- پاراستنا دینێ خودێ، و ب جهئینانا شریعەتێ وی، باشترین رێکە کو خودێ مرۆڤی ب سەربێخت، وسەرفەرازیێ بینتە رێکا وی ل دنیایێ وئاخرەتێ.

## حەدیسا بیستێ

عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ البدري –رضي الله عنه– قال: قال رَسُولُ الله –صلى الله عليه وسلم–: ﴿ إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحْيِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ ﴾.

رواه البخاري

ژ ئەبوو مەسعوودێ بەدری، عوقبەیێ کورێ عەمرێ ئەنصاری –خودێ ژێ رازی بت– دئێته ڤەگوهاستن، دبێژت: پێغەمبەری –سلاڤ لێ بن– گۆت: تشتێ مرۆڤ گەهشتینێ ژ گۆتنا پێغەمبەرینیا ئێکێ: ئەگەر تو شەرم نەکەی هەچیا تە دڤێت بکە.

بوخاری ڤەدگوهێزت

شەرم چەڤەکە ژ چەڤێن باوەریێ –وەکی د حەدیسێن دورست دا هاتی–، و ژ بلی خێرێ وباشیێ تشتەکێ دی ب شەرمێ ڤە نائێت، وئێک ژ وان سالۆخەتان یێن پێغەمبەرێ مە –سلاڤ لێ بن– پێ دهاتە نیاسین –وەکی صەحابیێن وی دبێژن– شەرم بوو، وشەرمە مرۆڤ ژ گەلەک خرابی وکێماسیان ددەتە پاش، وگرنگیا شەرمێ ژ ڤێ چەندێ دئێت.. وئەڤەیە ئەگەر د پشت هندێ ڕا کو پێغەمبەر هەمی شیرەتێ ب شەرمێ ل ئوممەتێن خۆ بکەن، حەتا وێ دەرەجێ کو ئەڤ ئاخفتنە مرۆڤ ژ وان وەربگرن، وەک میراتەکێ پیرۆز و د ناڤبەرا خۆ دا ڤەگێرن، جیلەک ل دویڤ جیلەکی، حەتا وە لێ بێت ئەو بتە ئەو گۆتن یا ل سەر هەمی ئەزمانان دگەڕیێت، حەتا ئەو گەهشتیە ئوممەتا دویماهیێ ژی کو ئوممەتا ئیسلامێیە.

و د ڤێ گۆتنا خۆ دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو شەرمە خودانێ خۆ ژ کارێن کێم وبێخێر دپارێزت، لەو گۆت: ئەگەر مرۆڤ ئەو بت یێ پەردەیێ شەرمێ لادای، هەر تشتەکێ هەبت ئەو دێ کەت، بێی هزرەکێ بۆ ئێکی بکەت، نە وەکی وی کەسی یێ ژ خودێ یان بەنیان شەرم دکەت، دەمێ ئەو کارەکی بکەت، بەری هنگی دێ هزرا خۆ تێدا کەت، ئەگەر ئەو کار یێ ب شەرم بت، ئەو دێ خۆ ژێ دەتە پاش ووی ناکەت.

ودو ڕەنگێن شەرمێ هەنە: شەرمەک ئەو یا ب ڕەنگەکێ فطری خودێ دایە مرۆڤی، وئەڤە ل نک هەمی مرۆڤان هەیە، و ب تنێ خێر پێڤە دئێت، وڕەنگەکێ (موکتەسەب) هەیە، وئەڤە ئەوە یا مرۆڤ ب دەست خۆ دئێخت، وئەڤەیە یا دبتە پشکەک ژ باوەریێ، ومرۆڤ پێ خودان خێر دبت، چونکی ئەو مرۆڤی ژ کارێن خراب ددەتە پاش.

وڕەنگەکێ شەرمێ هەیە یێ دورست نینە، چونکی ئەو وەکی ئێشێیە، یان هەما ئێش ب خۆیە، وەکی کو مرۆڤەکی شەرمەکا زێدەی حەددی ل نک هەبت، کو وی ژ هندێ بدەتە پاش ئەو ب حەقێ خودێ ڕابت، یان واجبێ خۆ د دەر حەقا مرۆڤان دا ب جهـ بینت، یان پسیارا دینێ خۆ نەکەت، یان تەخسیریێ د ژینا خۆ دا بکەت.. ئەڤ شەرمە یا باش نینە، چونکی ئەو لاوازی وسستیە.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- شەرم چەقەکە ژ چەقێن باوەریێ، لەو پێتڤیە ئەو ل نک مرۆڤێ خودان باوەر هەبت.

٢- شەرمێ خێر وباشی پێڤە دئێت، وهەچییێ باوەریا وی پتر بت شەرما وی دێ یا مەزنتر بت.

٣- ئەو شەرما دبتە ئاستەنگ د ناڤبەرا مرۆڤی و ب جهئینانا واجباتێن خۆ یێن شەرعی شەرمەکا باش نینە، ونە یا دورستە.

٤- پێتڤیه هەر ئێک ژ مە ژ لایێ خۆ ڤە شەرمێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت، وبەرێ خەلکی بدەتە شەرمینیێ.

٥- ژ مفایێن شەرمێ ئەو مرۆڤی ژ کارێن بێخێر ددەتە پاش.

٦- یێ شەرم ل نک نەبت، دێ یێ رِوی قائیم بت، وئەوێ رِوی قائیم بت دێ شانازیێ ب گونەهێ کەت، وکەسێ هۆسا بت خودێ گونەهێ بۆ وی ژێ نابەت.

## حەدیسا بیست ویێکێ

عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ الله الثَّقَفِيِّ –رضي الله عنه– قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله قُلْ لِي فِي الإِسْلاَمِ قَوْلاً لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَكَ، قال: ﴿ قُلْ آمَنْتُ بِالله ثم اسْتَقِمْ ﴾.

رواه مسلم

ژ سوفیانێ کورێ عەبدللاهێ ثەقەفی -خودێ ژێ رازی بت- دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: من گۆتە پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن-: گۆتنەکێ د ئیسلامێ دا بێژە من، ژ بلی تە ئەز پسیارا وێ ژ کەسێ دی نەکەم، وی گۆت: بێژە من باوەری ب خودێ ئینا، پاشی خۆ ڕاست بکە.

موسلم ڤەدگوهێزت

ئەڤە ئێک ژ وان حەدیسێن مەزنە یێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پێپک وقاعیدەیێن دینی تێدا کۆمکرین، و ژ پسیارا صەحابی ئاشکەرا دبت کو بەرسڤا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک دێ یا گرنگ بت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆتنەکا وەسا بۆ من بێژە، پشتی تە ئەز هەوجەی کەسێ دی نەبم ڤێ پسیارێ ژێ بکەم! ڤێجا هوین هزر دکەن بەرسڤ دێ یا چاوا بت؟!

د بەرسڤێ دا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- باوەری د گەل ئستیقامێ کۆمکر، گۆتێ: بلا تە باوەری ب خودێ هەبت، وڤێ باوەریا خۆ ب دەڤی ژێ ڕاگەهینە، وبێژە، پاشی د گەل ڤێ ئعترافا ب باوەریێ تو خۆ ل سەر باوەریێ ڕاگرە، ویێ ڕاست بە.. وئەڤ بەرسڤە یا وەرگرتیە ژ گۆتنا خودێ: ﴿ إِنَّ

ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۝ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ۝ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ۝﴾ (فصلت: ٣٠-٣٢) و ژ ئیمامێ عومەر دئێتە ڤەگوهاستن کو وی ئەڤ ئایەتە ل سەر مینبەرێ خواند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ ﴾ گۆت: یەعنی وان وەکی رویڤی نەکر! مەعنا: ل سەر گۆتنا خۆ ڕاست مان، ودەست نەدا فەند وفێلان.

ڤێجا ئستیقامە چیە؟

ئستیقامە ئەوە پشتی بەرێ مرۆڤی بۆ ڕێکا ڕاست دئێتەدان، مرۆڤ وێ ڕێکێ بگرت وبەرنەدەت، نە خۆ ب ڤی لایی دا خوار بکەت نە ب لایێ دی دا، وخۆڕاستکرن ل سەر ڕێکا خودێ ئەوە مرۆڤ بەردەوامییێ ل سەر طاعەتێ وی پێ ئاشکەرا وڤەشارتی بکەت، وخۆ ژ وان کاران بدەتە پاش یێن خودێ ئەو ژێ دایە پاش.. وئەڤە هەر ئەو شیرەتە یا خودێ ب خۆ ژێ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ودویکەفتیێن وی کری دەمێ گۆتی: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ ﴾ (هود: ١١٢) ئەی موحەممەد، تو وهەچییێ د گەل تە تۆبە کربت وەسا خۆ ڕاست بکەن وەکی فەرمان پێ ل هەوە هاتیەکرن.

ومفاییێن ئستیقامێ گەلەکن، هندەک ژ وان ئەون یێن د ئایەتا بۆری دا هاتین، دەمێ خودایێ مەزن گۆتی: ئەوێن باوەری ب خودایێ خۆ ئینای وئستیقامە ل سەر باوەریێ کری، ل دەمێ مرنێ ملیاکەت ب سەر وان دا ئێنە خوارێ، ومزگینییێ ددەنە وان کو هوین نەترست ژ وی تشتێ ل بەرا هەوە هەی، و ب خەم نەکەڤن ل سەر وی تشتێ هەوە ل پاش خۆ هێلای، خودێیە خەلیفێ هەوە ل سەر عەیالێ هەوە، وئەوە یێ کو دێ بەرێ هەوە دەتە وان بەحەشتێن خۆش یێن هەمی نعمەت تێدا هەین.

ئەڤە ل ئاخرەتێ، و ل دنیایێ.. خودێ دبێژت: ﴿ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ۝﴾ (الجن: ١٦) ئەگەر وان ئستیقامە ل سەر ڕێکا

راست کربا، ئەم بارانەکا ب مفا دا بۆ وان بارینین، ورزقەکێ بۆش وبەرفرەهـ دا دینێ. مەعنا: ل دنیایێ و ل ئاخرەتێ ئستیقامە مفایی دگەهینتە خودانێ خۆ.

وئەگەر چ پێگیریا تمام ب ئستیقامێ وەکی فەرمان پێ ل مە هاتیەکرن کارەکێ ب ساناهی نینە، ودبت گەلەک یا ب زەحمەت بت مرۆڤەک بشێت وێ ب تمامی ب جهـ بینت، بەلێ خودێ رێکەکا دی بۆ مە دانا کو وێ تەخسیریێ ڤەگرت، وێ کێماسیێ تژی بکەت، ئەو ژی رێکا (ئستغفارێ)یە، کو مرۆڤ هەردەم ئعترافێ بۆ خودایێ خۆ ب کێماسیا خۆ بکەت، وداخوازا لێبۆرینێ ژێ بکەت، خودایێ مەزن دئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ فَٱسْتَقِيمُوٓاْ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُۗ ﴾ (فصلت: ٦) وهەر وەکی ئەڤە ئیشارەتەکە بۆ هندێ کو تەخسیریا هەوە د ئستیقامێ دا هەر دێ هەبت، لەو هوین ئستغفارێ بکێشن وداخوازا لێبۆرینێ ژ وی بکەن، دا ئەو ل هەوە نەگرت.

وئستیقامە بەری هەر تشتەکی ب دلی دبت، چونکی دل مەلکێ لەشییە، چی گاڤا دلێ مرۆڤی ئستیقامە ل سەر نیاسینا خودێ وترسا ژ وی کر، تژی بوو ژ ڤیانا وی وخۆ هێلا ب هیڤیا وی ب تنێ ڤە، وبەرێ خۆ ژ هەر ئێکێ دی وەرگێرا، هنگی لەش هەمی دێ راست ودورست بت، وپشتی دلی ئەزمان دئێت، چونکی ئەزمان دەربرینێ ژ وی تشتی دکەت یێ د دلی دا هەی، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گەلەک جاران شیرەت ب گرتنا ئەزمانی ل صەحابیێن خۆ دکر، وئەگەر تە بڤێت بزانی کانێ ئستیقامە ل نک کەسەکی هەیە یان نە، بەرێ خۆ بدە ئەزمانێ وی.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ژ ڤێ حەدیسێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو صەحابیێن پێغەمبەری گەلەک دحەریص بوون وی تشتی بزانن یێ مفایێ وان تێدا هەی، لەو گەلەک جاران وان داخوازا شیرەتان بۆ خۆ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر.

٢- باوەری ب ئستیقامێ دئێتە ڕاگرتن، وئەو کەسێ باوەریێ بینت، بەلێ خۆ ل سەر ڕانەگرت، ئەو باوەری چو مفایی ناگەهینتێ، چونکی دبت ل دەمەکێ نێزیک ئەو لێڤە ببت و بەر ب کوفرێ ڤە بچت.

٣- ئستیقامە خێرا دنیایێ وئاخرەتێ ب دەست خودانی ڤە دئینت.

٤- ئستیقامە ب دلی وئەزمانی وئەندامێن دی یێن لەشی دبت.

## حەدیسا بیست ودووێ

عَـنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله الأنصاريِّ -رضي الله عنهما- أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُـولَ الله -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا صَلَّيْتُ الـصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَـاتِ، وَصُـمْتُ رَمَضَانَ، وَأَحْلَلْتُ الْحلاَلَ، وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ، وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا، أَأَدْخُلُ الْجَنَّـةَ؟ قال: ﴿ نَعَمْ ﴾.

رواه مسلم

ژ جـابرێ کـورێ عـەبـدللاهێ ئـەنـصاری -خـودێ ژێ رازی بـت- دئێتـە ڤەگوهاستن، دبێژت: زەلامەکی پسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لـێ بـن- کر، وگۆتێ: ئەرێ ئەگەر من نڤێژێن فەرز کرن، وئـەز رەمـەزانـێ یـێ ب رۆژی بووم، ومن تشتێ حەلال حەلال کر، وییێ حەرام حەرام کر، وتـشتـەکێ زێدەتر من نەکر، ئەرێ ئەز دێ چمە بەحەشتێ؟ گۆت: بەلێ.

موسلم ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە ژی بەرسڤا پێغەمبەریە -سلاڤ لێ بن- ل سەر پسیارەکا صەحابیەکێ وی، ل دۆر تشتەکێ گرنگ، ئەو ژی رێکا بـەحـەشـتێیە، ل دۆر وی کاری یێ بەرێ خودانێ خۆ ددەتە بەحەشتێ، و د ریوایەتەکا ڤێ حەدیسێ دا یا کو هەر موسلم ڤەدگوهێزت، هاتیە کو ئەو زەلامێ پسیار کری نوعمـانێ کورێ قەوقەلێ خوزاعی بوو، ودئێتە زانین کو ئەو ئێک ژ وان صەحابیان بوو یێن ل شـەرێ بـەدرێ ئـامـادە بـووی، و ل شـەرێ ئوحودێ شـەهید بووبـوو، و ژ حەژێکرنا وی بۆ بەحەشتێ وی ڤیا پسیارەکا وەسا ژ پێغـەمبـەری بکـەت

بزانت کانێ چ رێ هەیە بەرێ وی بدەتە بەحەشتێ، ووی د ڤێ پسیارا خۆ دا حەلال وحەرام، وکارێ دلی وپێ لەشی هەمی کۆمکر، وئاشکەرایە کو ئیسلام ژ ڤێ چەندێ دەرناکەڤت.

د پسیارا خۆ دا ڤی صەحابی دو نموونە ژ کارێن فەرز گۆتن، کرنا هەر پێنج نڤێژێن فەرز، د شەڤەک ورۆژەکان دا، کو ستوینا ئیسلامێیە، وئەو پەردەیە یێ دکەفتە ناڤبەرا مرۆڤی وکوفرێ دا، وئێکەمین کارە رۆژا قیامەتێ حسێبا وی د گەل مرۆڤی دئێتەکرن، وگرتنا رۆژیێن هەیڤا رەمەزانێ، کو ئەو ژی ئێک ژ پێنج ستوینێن دینێ مەیە، وئەڤ هەردووە فەرزن، و ژ بلی وان نڤێژ ورۆژیێن سوننەت ژی هەنە، بەلێ پسیارا ڤی صەحابی ئەڤەیە: ئەرێ ئەگەر مرۆڤەک هەبت، کارێ فەرز ب تنێ بکەت، ئەڤە چەندە دێ بتە ئەگەر ئەو بچتە بەحەشتێ؟ ودەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتیێ: بەلێ، مەعنا وێ ئەوە دورستە مرۆڤ کارێ سوننەت نەکەت، وهەر چەندە ئەم دبێژین دورستە ژی، بەلێ کرنا سوننەتان خێرەکا مەزن دگەهینتە خودانی، وهەما بەسە بێژین: د حەدیسەکا قودسی دا هاتیە: ﴿ ولا يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه ﴾ یەعنی: عەبدێ من دێ مینت خۆ ب کرنا سوننەتا نێزیکی من کەت، حەتا ئەز حەز ژ وی بکەم.. وئەو مرۆڤێ پشت ددەتە کرنا سوننەتان ئەو خێرەکا مەزن ژ دەست خۆ دکەت.

وپشتی ئینانا دو نموونەیان (یێ نڤێژێ ورۆژیێ) ل سەر کرنا کارێ فەرز، ڤی صەحابی کو قاعیدەیێن گشتی ژی ئینان، وگۆت: ئەگەر من تشتێ حەلال حەلال کر، ویێ حەرام حەرام کر.. یەعنی: ئەگەر من باوەری پێ ئینا، وتشتێ حەلال (نە یێ فەرز) تێرا مرۆڤی هەیە باوەریێ ب حەلالیا وی بینت، ئەگەر خۆ نەکەت ژی، بەلێ تشتێ حەرام دڤێت مرۆڤ باوەریێ بینت کو ئەو یێ حەرامە، وخۆ نێزیک ژی نەکەت.

وتشتێن ئاشکەرایە د شریعەتێ ئیسلامێ دا کو حەلالکرن وحەرامکرن حەقەکە ژ حەقێن خودێ، و ژ بلی خودێ کەسێ حەق نینە تشتەکی حەلال

بکەت یان حەرام بکەت، وهەر کەسەکێ ڤی حەقی بدەتە خۆ، یان باوەریێ نەئینت کو ئەو حەقێ خودێیە، دێ کافر بت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ژ ڤێ حەدیسێ ژی وەکی یا بۆری ئاشکەرا دبت کو صەحابیێن پێغەمبەری گەلەک دحەریص بوون وی تشتی بزانن یێ مفایێ وان تێدا هەی، لەو گەلەک جاران وان پسیارا تشتێ خێرا دینێ وان تێدا هەی وان بۆ خۆ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر.

٢- وحەدیس هندێ دگەهینت کو کرنا کارێن واجب، وباوەری ئینان وپێگیریا ب حەلالی وحەرامی رێکا چوونا بەحەشتێیە.

٣- وژێ دئێتە زانین کو دورستە بۆ مرۆڤی کارێن فەرز ب تنێ ب جه بینت، وسوننەتان نەکەت، هەر چەندە کرنا سوننەتان خێرەکا مەزن تێدا هەیە ژی.

# حەديسا بيست وسێيێ

عَـنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ -رضي الله عنه- قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله-صلى الله عليه وسلم-: ﴿ الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لله تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُـبْحَانَ الله وَالْحَمْـدُ لله تَمْلآنِ - أَوْ تَمْلأُ - مَا بَيْنَ الـسَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالـصَّلاَةُ نُـورٌ، وَالـصَّدَقَةُ بُرْهَـانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَائِعٌ نَفْـسَهُ فَمُعْتِقُهَـا أَوْ مُوبِقُهَا ﴾.

رواه مسلم

ژ بـابێ مـالكێ ئـەشعەری -خودێ ژێ رازی بت- دئێتـە ڤـەگوهاسـتن، دبێژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- گـۆت: خۆپـاقژكرن نیڤـا بـاوەرییێـە، و (الحمد لله) تەرازیێ تـژی دكـەت، و (سبحان الله والحمد لله) د ناڤبـەرا عـەسـمانان وعـەردی دا تـژی دكـەن، ونڤێـژ رۆناهیـە، ودانـا خێـرێ دەلیلـە، وصەبر رۆناهیە، وقورئان هێجەتە بۆ تە یان ل سەر تە، هەمی مـرۆڤ سپێدێ دەردكەڤن، ڤێجا هندەک ژ وان خۆ رزگار دكەن، وهندەک خۆ تێ دبەن.

موسلم ڤەدگوهێزت

د ڤێ حەدیسێ دا پێغـەمبـەر -سلاڤ لـێ بـن- بـەحسێ گـەلـەک خێـرێن مەزن دكەت، وبەرێ مە ددەتێ، ژ وان خێران:

**خۆپاقژكرن:** وهەر چەندە د فقهێ ئیسلامێ دا دەمێ بەحسێ خۆپـاقژكرنێ دئێت، مەخسەد پێ راكرنا بێ نڤێژی وبێ دەسنڤێژییێیە ب رێكا خۆشویـشتن ودەسنڤێژ گرتنێ، بەلـێ خۆپـاقژكرن د رامانـا خـۆ دا بـەرفرەهتـرە، چونكی خـۆ

دویرکرنا مرۆڤی ژ هەر پیساتیەکا حسی یان مەعنەویا هەبت رەنگەکێ خۆپاقژکرنێیە، وزانایێن حەدیسێ ب خیلاف چووینە د شەرحکرنا گۆتنا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: خۆپاقژکرن نیڤا باوەریێیە، هندەک دبێژن: مەخسەد ب باوەریێ ل ڤێرێ نڤێژە، ونڤێژ بێی خۆپاقژکرن نابت، یەعنی: هەر وەکی خۆشویشتن ودەستڤێژگرتن نیڤەکا نڤێژێیە. وهندەک دبێژن: خەسلەتێن باوەریێ دو پشکن: پشکەک دلی پاقژ دکەن، وئەڤە گۆتن وکریارن، وپشکەک لەشی پاقژ دکەن، وئەڤە خۆپاقژکرن ودەستڤێژگرتنە.. و ب ڤێ چەندێ (طوهوور) دبتە نیڤا باوەریێ.. وخودێ چێتر دزانت.

**زکرێ خودێ:** و ب تایبەتی گۆتنا (الحمد لله) و (سبحان الله والحمد لله)، یەعنی: مرۆڤ ب ئەزمانی ئعترافێ ب قەنجیا خودێ ل سەر خۆ بکەت، وحەمدا وی بکەت، ووی پاک وپاقژ بکەت ژ هەر کێماسیەکا نەزان د دەر حەقێ وی دا دبێژن، وگۆتنا ڤی زکری ب دەڤی، د گەل باوەری ئینانا ب دلی، تەرازیا خودانێ خۆ تژی خێر دکەن، وخێرا وان ئەگەر ببتە لەشەکێ خودان حەجم دێ وێ مەسافا د ناڤبەرا عەرد وعەسمانان دا هەمی تژی کەت، ژ ڤێ پارچەیا حەدیسێ دئێتە زانین کو ئەو گۆتنێن مرۆڤ د دنیایێ دا دبێژت، چ باشی بن چ خرابی، رۆژا قیامەتێ دێ د تەرازیا مرۆڤی دا ئێنە دانان وکێشان، لەو دڤێت مرۆڤ گەلەک ل ئەزمانێ خۆ یێ هشیار بت.

**کرنا نڤێژێ:** نڤێژ بۆ خودانی دبتە رۆناهی، ل دنیایێ بۆ وی دبتە رۆناهی ئەو رێکا حەقیێ پێ دنیاست، وپێ ب هیدایەت دکەڤت، ئەگەر هات ووی ئەو ب دورستی کر، و د رامانێن وێ گەهشت، و ل رۆژا قیامەتێ ژی بۆ وی دبتە رۆناهی بەرێ وی ددەتە رێکا بەحەشتێ، د دنیایێ دا ئەو نەفسا خودانێ خۆ پاقژ دکەت، ووی بەرهەڤ دکەت بۆ چوونا بەحەشتێ ل ئاخرەتێ.

**دانا خێران:** وئەو دەلیلەکێ ئاشکەرایە ل سەر هندێ کو مرۆڤێ خێرکەر شیایە خۆ ژ بەخیلیا نەفسێ بپارێزت، وفەرمانا خودێ ب درێژکرنا دەستێ هاریکاریێ بۆ هەوجەیان ب پێش فەرمانا نەفسا خۆ بێخت.. ودانا خێران

باشترین هێجەت ودەلیلە ل هندێ کو مرۆڤێ خێرکەر باوەریەکا دورست ونەفسەکا پاقژ ژ چریکی وحەسویدی ونەڤیانێ هەیە.

**صەبرا ل سەر نەخۆشیان:** وباش بەرێ خۆ بدەنە گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ دبێژت: (والصبر ضیاء) بۆچی نەگۆت: (الصبر نور) وەکی گۆتی: (الصلاة نور)، چ فەرق د ناڤبەرا (ضیاء) و(نور) دا هەیە؟ (ضیاء) وەکی زمانزان دبێژن ئەو رۆناهیە یان تێن وسۆتنی د گەل دا هەی، وەکی رۆناهیا رۆژێ، و(نور) ئەو رۆناهیە یا بێ تێن وسۆتنی، وەکی رۆناهیا هەیڤێ، خودێ د ئایەتەکێ دا دبێژت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِیَآءً وَٱلۡقَمَرَ نُورًا ﴾ (یونس: ٥) وصەبر هەر چەندە گەشاتییێ ورۆناهییێ ددەتە خودانی، بەلێ ژ لایەکێ دی ڤە ژ بەر نەخۆشی وگرانیا وێ سۆتنی ژی تێدا هەیە، لەو خێرا وێ ژی یا بێ حسێبە وەکی خودێ ب خۆ دبێژت: ﴿ إِنَّمَا یُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَیۡرِ حِسَابٍ ۝ ﴾ (الزمر: ١٠).

**قورئان هێجەتە:** هێجەتە بۆ وی کەسی یێ ئەو خواندی وکار پێ کری، هنگی رادوەستت حەتا بەرێ وی ددەتە بەحەشتێ، وهێجەت ل سەر وی کەسی یێ باوەری پێ نەئینای، خواندی وکار پێ نەکری، شاهدەیێ ل سەر وی ددەت، وهنگی رادوەستت حەتا بەرێ وی ددەتە ئاگری.

وکارێ هەر مرۆڤەکی یێ جودایە ژ کارێ ئێکێ دی، هندەک کاری بۆ رزگارکرنا نەفسا خۆ ژ عەزابا ئاخرەتێ دکەن، وهندەکێن دی بێ ئەمریا خودایێ خۆ دکەن، و ب ڤێ چەندێ خۆ تێ دبەن!

**مفایێن حەدیسێ:**

١- باوەری گۆتن وکریارە، ب طاعەتی زێدە دبت، و ب گونەهێ کێم دبت.

٢- پێتڤیە ئەم وان کارێن باش بکەین یێن د ڤێ حەدیسێ دا هاتین، دا خێرێن مە زێدە ببن.

## حەدیسا بیست وچارێ

عَنْ أَبِي ذَرٍّ -رضي الله عنه- عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فِيمَا رَوَى عَنِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ: ﴿ يَا عِبَادِي، إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلاَ تَظَالَمُوا. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ. يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ. يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ ﴾.

رواه مسلم

ئەڤ حەدیسە -وەکی ئاشکەرا- ئێک ژ حەدیسێن (قودسیە)، وحەدیسا قودسی ئەوە یا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ل دەسپێکێ دبێژت: خودێ دبێژت.. یەعنی: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گۆتنێ بۆ خودێ پال ددەت،

وجودابیا ئاشكەرا د ناڤبەرا قورئانێ وحەدیسا قودسی دا ئەوە قورئان لەفز ومەعنایا وێ ژ نک خودێیە، بەلێ حەدیسا قودسی مەعنا ژ خودێیە، بەلێ لەفز ژ پێغەمبەریە -سلاڤ لێ بن-.

وپتریا حەدیسێن قودسی ناڤەرۆکا وان ل دۆر ناڤ وسالۆخەتێن خودێ دزڤرت، هەر وەسا ئەو تشتێن پەیوەندی ب ذاتێ خودێ ڤە هەی.. وەکی ژ ڤێ حەدیسا بۆری بۆ مە ئاشكەرا دبت، ئەوا خودایێ مەزن تێدا -وەکی پێغەمبەر ژێ ڤەدگوهێزت- بەحسێ هندەک سالۆخەتێن خۆ بۆ مە دکەت، ودبێژت: ﴿ يَا عِبَادِي، إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلاَ تَظَالَمُوا ﴾ ئەی عەبدێن من، هندی ئەزم من زولم ل سەر خۆ حەرامكریە، ومن ئەو د ناڤبەرا هەوە ژی دا حەرامكریە، ڤێجا هوین زولمێ نەكەن.. وزولم د مەعنا خۆ یا ئەصلی دا دەربازكرنا توخوبیانە، هەر وەسا ئەو بۆ لادانا ژ رێکا راست ژی دئێت، وزولم دو رەنگن: كو مرۆڤ زولمێ ل خۆ بكەت، شریكان بۆ خودێ بدانت، یان بەر ب گونەهێن دی یێن بچویک یان یێن مەزن ڤە بچت، وكو مرۆڤ زولمێ ل كەسەكێ دی بكەت، پێ ل توخوبێن وی بدانت، یان حەقێ وی بخوت.. وئەڤ هەردو رەنگێن زولمێ دحەرامن. وزولم نیشانا كێماسیا خودانیە، لەو خودێ ذاتێ خۆ یێ پیرۆز ژێ پاككریە، وگۆتیە: من ئەو ل سەر خۆ حەرامكریە!

وپشتی پاككرنا ذاتێ خودێ ژ زولمێ، حەدیسێ هەژاری وهەوجەییا مرۆڤان هەمیان بۆ خودێ راگەهاند، وئاشكەرا كر كو خودێ یێ دەولەمەندە، ووی منەت ب كەسێ نینە، وگۆت: ﴿ يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ ﴾ ئەی عەبدێن من، هوین هەمی دبەرزەنە ئەو تێ نەبت یێ من بەرێ وی دایە هیدایەتێ، ڤێجا هوین داخوازا هیدایەتێ ژ من بكەن، ئەز دێ بەرێ هەوە دەمە هیدایەتێ، ئەی عەبدێن من، هوین هەمی دبرسینە ئەو تێ نەبت یێ من تێر كربت، ڤێجا

هوین داخوازا خوارنێ ژ من بکەن، ئەز دێ خوارنێ دەمە هەوە، ئەی عەبدێن من، هوین هەمی دبرویسن ئەو تێ نەبت یێ من جلک کریە بەر، ڤێجا هوین داخوازا جلکی ژ من بکەن، ئەز دێ جلکی کەمە بەر هەوە، ئەی عەبدێن من، ب شەڤ ورۆژ هوین گونەهان دکەن، وئەزم یێ هەمی گونەهان ژێ دبەم، ڤێجا هوین داخوازا ژێبرنا گونەهان ژ من بکەن، ئەز دێ گونەهێن هەوە بۆ هەوە ژێ بەم.

و ژ ڤێ چەندێ دیار دبت کو ئەم هەمی دهەوجەی هیدایەت ورزق ورەحما خودێینە، وکو ئەو ل مە ببۆرت وگونەهێن مە ژێ ببەت، چونکی ئەوە یێ هەر تشتەکێ هەی ب دەستێ وی.. ومادەم هەر تشتەکێ هەی ب وییە، و د دەستێ وی دایە، دڤێت هیڤی ورجایا مە ژ وی ب تنێ بت، وهەوارا مە ل بەر دەرگەهێ وی ب تنێ بت، نە کەسێ دی.

ودەمێ خودێ فەرمانێ ل مە دکەت کو ئەم هیدایەتێ ورزقی ورەحمێ ژ وی بخوازین، دڤێت نەئێتە هزرکرن کو وی منەت ب داخواز وخواستنا مە هەیە، نەخێر.. ﴿ يَا عِبَادِي، إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا ﴾ ئەی عەبدێن من، کەس ژ هەوە نەشێت زیانەکێ بگەهینتە من، یان مفایەکی، وئەگەر هوین هەمی، یێن پێشییێ ویێن پاشییێ، مرۆڤ وئەجنە، وەکی باشترین زەلامی بن ژ هەوە، ئەو تشتەکی ل ملکێ من زێدە ناکەت، وئەگەر هوین هەمی وەکی خرابترین زەلامی بن، ئەو تشتەکی ژ ملکێ من کێم ناکەت..

مەعنا مفایێ باشییێن هەوە هەر بۆ هەوەیە، وزیانا خرابییێن هەوە ژی هەر بۆ هەوەیە، وخودێ هەما کارێن هەوە دهژمێرت، وبۆ هەوە حسێب دکەت، وئەو دێ هەوە سەرا جزا دەت، وهوین نەشێن چویێ ژ ملکێ وی کێم بکەن:

﴿ يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ الله، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ ﴾ ئەی عەبدێن من، ئەگەر هوین هەمی، یێن پێشییێ ویێن پاشییێ، مرۆڤ وئەجنە، ل عەردەکی راوەستن، وداخوازێ ژ من بکەن، وئەز هەر ئێکی داخوازا وی بدەمێ، ئەو تشتەکی ژ ملکێ من کێم ناکەت، وەسا نەبت وەکی دەرزیک تشتەکی ژ ئاڤا دەریایێ کێم دکەت، دەمێ دچتە تێدا.. خزینەیا رەحما خودێ گەلەک ژ هندێ فرەهترە کو ب دانێ کێم ببت، یان خلاس ببت.. یا رەببی، رەحما تە ژ هندێ مەزنترە کو گونەهێن مە ب سەردا بگرن، ئەم عەبدین وەکی خۆینە، دگونەهکارین، وتو رەببی وەکی خۆیی یێ غەففاری، ئەگەر مە وەکی خۆ کر، تو وەکی خۆ بکە.. تو بەرێ مە بدە وێ رێکێ یا تە ڤیای، بەری ئەو دەم بێت کو ئەم ل وێ رێکێ پەشێمان ببی یا مە ڤیای وتە نەڤیای!

**مفاییێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو رەحما خودێ گەلەک یا مەزنە، وخزینەیێن وی دبێ دویماهینە، وهەر تشتەکێ هەی ب دەستێ وییە، ودڤێت ئەم ژ وی بخوازین.

٢- و حەدیس هندێ دگەهینت کو دڤێت ئەم لۆمەی خۆ بکەین سەرا خرابییێن خۆ، وحسێبێ د گەل نەفسا خۆ بکەین، دا بەرێ وێ ژ رێکا راست نەئێتە لادان.

# حەدیسا بیست وپێنجێ

عَنْ أَبِي ذَرٍّ -رضي الله عنه- أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالُوا لِلنَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم-: يَا رَسُولَ الله، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ. قَالَ: ﴿ أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ الله لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ، إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ ﴾. قَالُوا: يَا رَسُولَ الله، أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: ﴿ أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ، أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الحَلاَلِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ ﴾.

رواه مسلم

ئەبوو ذەر -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: هندەک مرۆڤ ژ صەحابیێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-: مرۆڤێن مالدار خێر هەمی بۆ خۆ برن، ئەو وەکی مە نڤێژان دکەن، ووەکی مە رۆژیان دگرن، و ب مالێ خۆ یێ زێدە خێران دکەن. پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ما خودێ تشتەکبۆ هەوە ژێ نەدانایە هوین خێران پێ بکەن؟ ب هەر تەسبیحەکێ خێرەک هەیە، و ب هەر تەکبیرەکێ خێرەک هەیە، و ب هەر تەحمیدەکێ هەیە، و ب هەر تەهلیلەکێ خێرەک هەیە، وفەرمانا ب باشیێ خێرە، وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ خێرە، و د چوونا نڤینێ دا بۆ ئێک ژ هەوە خێر هەیە. گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئێک ژ مە شەهوەتا خۆ ب جهـ بینت، وخێر بۆ بێتە نڤیسین؟! گۆت: ئەرێ ما ئەگەر وی د حەرامی دا ب جهئینابا

بۆ وی گونەهـ نەدبوو؟ وەسایە ئەگەر وی د حەلالـی ژی دا ب جهئینا دێ بـۆ وی خێر بت.

موسلم ڤەدگوهێزت

ژ ڤێ حەدیسێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کانێ صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چەند دمجد بوون د کۆمکرنا خێـران دان، و د نافـسا د کـارێ بـاش دا، ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک صەحابییێن فەقیر هاتنە نک پێغەمبەری -سـلاڤ لێ بن- وگازندەییێن خۆ گەهاندنێ، کو هەر خێرەکا ئەو دکەن، برایێن وان یێن دەولـەمەند ژی دکەن، وزێدەی ڤێ چەندێ ئەو خێران ب مـالـێ خـۆ ژی دکـەن، مەعنا: خێرێن مالداران ژ یێن وان پترن، وچونکی بەردەستێ وان یێ تـەنگـە ئەو قەت نەشێن بگەهنە وان.. هەر وەکی وان ب ڤێ چەندێ دڤیـا پێغـەمبـەر -سلاڤ لێ بن- تشتەکی نیشا وان بـدەت، ئـەو وی بکـەن، وخێـرێن خـۆ پـێ زێدە بکەن، دا دەرەجا وان د بەحەشتێ دا ژ یا برایێن وان کێمتر نەبت..

گاڤـا پێغـەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- ئـەڤ چـەنـدە ژ وان دیتـی، بـۆ وان ئاشکەرا کر کو مـەیدانا مونافـەسا د خێرێ دا، یـا بـەرفـرەهـە، ب رەنگـەکێ وەسـا کـو ئـەگـەر مرۆڤـەک ژ بـەر مانعـەکی نـەشـیا مونافـەسێ د خێـرەکـێ دا بکەت ژی، گەلەک کارێن دی هەنە ئەو دشێن قەست بکـەتـێ، وخێـرێن مـەزن بۆ وان پێڤە بێن، وپێغەمبەری -سلاڤ لـێ بـن- د ڤـێ گۆتنـا خـۆ دا بـەحسـێ سێ ژ وان کاران کرن، ئەو ژی ئەڤەنە:

١- کرنا زکرێ خودێ ب ئەزمانی: ب تایبەتی گۆتنا: (سبحان الله، الله أكبر، الحمد لله، لا إله إلا الله) ئەڤ گۆتنێن ب ساناهی ل سەر ئـەزمـانـی، خێرێن مەزن پێڤە دئێن، ئەگەر مرۆڤ ب ئنیـەتەکا باش بێژت، وبـاوەریـێ پـێ بینت.. وئەگەر ئەڤ خێرە ئەو بن یێن فایـدەیـێ وان دگـەهتـە مرۆڤـی ب تنـێ هندەک خێرێن دی یێن گشتی ژی هەنە مفایێ وان دگەهتـە خـەلکـێ دی ژی، ژ وان ئەڤ کارێ دوویێیە.

٢- فەرمانا ب باشیێ، وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ: مرۆڤ دەمێ باشییەکێ بزانت، نیشا خەلکی ژی بدەت، وگاڤا دیت کەسەک یێ خرابییەکێ دکەت، وی ئاگەهدار بکەت، و ژ وی کارێ خراب بدەتە پاش، یەعنی: مرۆڤەکێ خێرخواز بت، وپێ خۆش نەبت خرابی بەلاڤببت، ئەڤە ژی بۆ وی خێرە، ودەرەجێن وی پێ بلند دبن.

٣- عەدەت وکارین حەلال ب ئنیەتا باش دبنە خێر وعیبادەت: هەر کارەکێ حەلال، یان عەدەتەکێ جڤاکی یێ باش یێ هەبت، مرۆڤ ئەگەر بکەت وئنیەتا وی یا باش بت، بۆ وی ب خێر حسێب دبت، وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ ئێک ژ کارێن زێدە تایبەت ب مرۆڤی ڤە کر، کو ب جهئینانا شەهوەتێیە ب رێکا حەلال، ئەگەر ئنیەتا وی ئەو بت ئەو ب ڤی کاری خۆ ژ حەرامیێ بپارێزت، وحەقێ ژنکا خۆ ژ سەر خۆ راکەت، مەعنا: عەدەت ب ئنیەتا باش دبتە عیبادەت.

ودەمێ صەحابیان عەجێبیا خۆ ژ ڤێ گۆتنێ دیارکری، وگۆتی: چاوا ئێک ژ مە شەهوەتا خۆ، یەعنی: ئێک ژ تایبەتیێن خۆ ب کار بینت، وخێر بۆ بێتە نڤیسین؟! پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەری وان دا قیاسێ، وگۆتێ: ئەرێ دەمێ ئێک ژ هەوە شەهوەتا خۆ ب رێکا حەرامی ب کار بینت ما گونەهـ بۆ وی نائێتە نڤیسین؟ بەلێ.. هەر وەسا ئەگەر ئەو د حەلالیێ ژی دا ب کار بینت، هنگی خێر دێ بۆ ئێتە نڤیسین.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو صەحابیان مونافەسە د کارێن باش دا دکر، وبەرێ وان لێ بوو هەر ئێک ژ وان باشیێن خۆ پتر لێ بکەت.

٢- کارێن حەلال وعەدەت ئەگەر مرۆڤ ب ئنیەتەکا باش بکەت، دبنە عیبادەت، وخێرێن مرۆڤی پێ زێدە دبن.

٤- رێکێن خێرێ گەلەکن، ومرۆڤ هەر دێ شێن ئێک ژ وان کەت.

٥- مرۆڤێ زانا دەمێ تشتەکی دبێژت، وپسیارا دەلیلی ژێ دئێتەکرن، دا ئەو ئاخفتنا خۆ پێ پەسەند بکەت، بلا بێزنتەنگ نەبت، ودەلیلێ خۆ بێژت دا ئاخفتنا وی پتر جهێ خۆ د دلێن خەلکی دا بکەت.

٦- سەرەدەریا مێری یا باش د گەل ژنێ، ویا ژنێ د گەل مێری، ئێک ژ وان کارێن باشە یێن ئەو پێ نێزیکی خودێ دبن.

## حەدیسا بیست وشەشێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رضي الله عنه- قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ -صلى الله عليه وسلم-: ﴿كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ -قَالَ- تَعْدِلُ بَيْنَ الاِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، -قَالَ- وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خَطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ، وَتُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ﴾.

رواه البخاري مسلم

ئەبوو هورەیرە -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پیغەمبەری -سلاڤ لی بن- گۆت: هەر هەستیکەکی ژ مرۆڤی خێرەک ل سەر هەیە، هەر رۆژەکا رۆژ تێدا دهەلێت تو دووان پێک بینی خێرە، وتو هاریکاریا زەلامی بکەی د دوارا وی دا وی لێ سویار بکەی، یان بارێ وی هلدەیە سەر خێرە، وگۆتنا باش خێرە، وهەر گاڤەکا تو بۆ نڤێژێ بهاڤێژی خێرە، وتو نەخۆشییێ ژ رێکێ لادەی خێرە.

بوخاری و موسلم ڤەدگوهێزن

گاڤا لەشێ مرۆڤی ل ڤویناغێن دەسپێکێ دورست دبت، وبەری گۆشتی بگرت هەستییێ وی چێ دبت، وپشتی ڤەرڤۆدەیێ هەستی دورست دبت، گۆشت ب سەر دا دئێت، ولەشێ مرۆڤی تمام دبت، وبەرهەڤ دبت بۆ دانا رحێ .. ولەش ئەوێ پتریا وی گۆشتێ نەرم، قالبەکێ هەستی یێ موکم هەیە، ودا حەرەکە ولڤینا مرۆڤی یا خۆش و ب ساناهی بت خودایێ ئافرەندەر

ئەڤ قەرقۆدەيێ هەستی وەسا چێكریە كو ژ هژمارەكا هەستیكێن جودا جودا د حەجمێ خۆ دا پێک بێت، وڤان هەستیكان ب هندەک گەهێن نەرم بۆ حەرەكە ولڤلڤاندنێ، ویێن موكم وقاییم بۆ قەتاندنێ بگەهنە ئێک وپێكڤە بێنەگرێدان، وئەڤ گەهەنە یێن كو ب عەرەبی دبێژنێ: (مەفاصل). وحەتا بەری بیست سیهـ سالان ژی، زانایێن لەشی -ب هەمی پێشكەفتنا خۆ ڤە- نەدزانی كانێ هژمارا ڤان گەهان د لەشێ مرۆڤی دا چەندن، حەتا ئنسكلۆبیدیایا بریتانی -بۆ نموونە- دەمێ دئێنە سەر بەحسێ گەهێن لەشی هژمارا دورست یا ڤان گەهان دەسنیشان ناكەت، ونابێژت كانێ ئەو چەندن، وئنسكلۆبیدیایا (هچنسوون) ئەوا ل سالا (١٩٩٥ ز) هاتیە بەلاڤكرن دیار دكەت كو هژمارا هەستیكان د قەرقۆدەیێ لەشێ مرۆڤان دا (٢٠٦) هەستینە، مەعنا ب تنێ دوسەد وشەش گەهـ دڤێت د لەشێ مرۆڤی دا هەبن.. بەلی پشتی هنگی ب دەمەكێ كێم، یەعنی: د ڤان هەر دەهـ سالێن بۆرین دا بۆ زانایێن بسپۆر دیار بوو كو ئەڤ هژمارە یا دورست نینە، ویا دورست ئەوە (٣٦٠) گەهـ د لەشێ مرۆڤی دا هەنە. وئەڤ هژمارە عەینی وێ هژمارێیە یا پێغەمبەرێ مە -سلاڤ لێ بن- بەری پتر ژ هزار وچارسەد سالان دەسنیشانكری، دەمێ د حەدیسەكا خۆ دا -یا ئیمامێ موسلم ژ عائیشایێ ڤەدگوهێزت- دبێژت: ﴿ إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمِائَةِ مَفْصِلٍ، فَمَنْ كَبَّرَ اللهَ وَحَمِدَ اللهَ وَهَلَّلَ اللهَ وَسَبَّحَ اللهَ وَاسْتَغْفَرَ اللهَ، وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلاَثِمِائَةِ السُّلاَمَى، فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ ﴾ یەعنی: هەر مرۆڤەک ژ ئادەمیان ل سەر سێ سەد وشێست گەهان یێ هاتیە ئافراندن، ڤێجا هەچیێ بێژت: الله أكبر، والحمد لله، ولا إله إلا الله، وسبحان الله، وأستغفر الله، یان بەرەكی ژ رێكا خەلكی راكەت، یان ستریەكێ یان هەستیەكی ژ رێكا وان راكەت، یان فەرمانێ ب باشیەكێ بكەت، یان بەرێ خەلكی ژ خرابیەكێ بدەتە پاش، هندی هژمارا وان سێ سەد وشێست گەهان، هنگی ئەو دێ ب رێڤەچت ووی نەفسا خۆ ژ ئاگری راخراندیە.

ئەڤ حەدیسە پتر مەعنایا حەدیسا دەسپێکێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، چونکی ئەو هژمارا هەستیکان، یان وان گەهێن لەشێ مرۆڤی ژێ پێک دئێت دەسنیشان دکەت، وئەڤە وەک (ئعجازەکا علمی) د سوننەتێ دا دئێتە هژمارتن، وحەدیس تێکدا هندێ دگەهینت کو دینێ ئیسلامێ دخوازت دلێن مرۆڤان بگەهینتە ئێک، وئاخفتنا وان بکەتە ئێک، وڤیانێ وهاریکاریێ د ناڤبەرا وان دا بەلاڤ بکەت.. حەدیس ئیشارەتێ ددەتە ئێک ژ نعمەتێن مەزن یێن خودێ د گەل مرۆڤان کرین، کو ئافراندنا وانە ب رەنگەکێ وەسا ژیانا وان ب ساناهی ب رێڤە بچت، وبەرێ وان ددەتە شوکرا خودێ، وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دیار دکەت کو هەر رۆژ هندی هەستی د لەشێ مرۆڤی دا هەنە (کو ٣٦٠، وەکی ژ هندەک ریوایەتێن دی دئێتە وەرگرتن) هند خێرێن واجب ل سەر هەر مرۆڤەکی هەنە.

وپشتی دیارکرنا ڤێ چەندێ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دا هندەک ژ وان خێران یێن کو باشە مرۆڤ بکەت؛ دا حەقێ نعمەتا دانا هەستیان ژ سەر خۆ راکەت، ژ وان خێران:

١- پێکئینانا د ناڤبەرا مرۆڤێن لێککەفتی دا، و ژ بەر گرنگیا ڤی کاری، شریعەتی بۆ مرۆڤی دورست کر خۆ ئەو درەوێ ژێ بکەت دا دو کەسێن ژێک سل یان لێککەفتی پێک بینت.

٢- هاریکاریا خەلکی، وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەحسێ رەنگەکێ هاریکاریێ کر ئەو ژی ئەوە مرۆڤ هاری کەسەکی بکەت دا سویار ببت، یان بارێ خۆ ل دەوارێ خۆ بکەت.

٣- ئاخفتنا باش، چ زکرێ خودێ بت، یان گۆتنا خێرێ بت، یان فەرمانا ب باشیێ بت، وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ بت.

٤- چوونا مزگەفتێ بۆ کرنا نڤێژێ، و د حەدیسێن دورست دا هاتیە کو ب هەر پێگاڤەکێ خێرەک بۆ مرۆڤی دئێتە نڤیسین.

٥- خۆشکرنا ڕێکێ، ب ڕاکرنا وان تشتان یێن نەخۆشییێ دگەهیننە ڕێباران، و د هندەک حەدیسێن دورست دا هاتیە کو لادانا نەخۆشییێ ژ ڕێکێ چەقەکە ژ چەقێن ئیمانێ.

و د هندەک ریوایەتێن دورست ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هاتیە ڤەگوهاستن کو کرنا دو رکاعەتێن نڤێژا تێشتەگەهێ جهێ وان (٣٦٠) خێران دگرت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- حەدیس هندێ دگەهینت کو مەفهوومێ خێرێ گەلەک یێ بەرفرەهە، وهەر قەنجیەکا هەبت گۆتن بت یان کریار بت، دکەفتە د بن دا.

٢- حەدیس بەرێ مە ددەتە کرنا کارێن خێرێ، ئەگەر خۆ سوننەت ژی بن؛ چونکی ئەو مرۆڤی پتر نێزیکی خودێ دکەن.

٣- هەر وەسا حەدیس بەرێ مە ددەتە خەمخوارنا ژ پاقژکرنا جهێن گشتی، وەکی ڕێکان، بۆ هندێ دا ژینگەها مە پاقژ وبژوین بمینت.

٤- حەدیس خێرا هندەک کاران بۆ مە بەرچاڤ دکەت، وەکی: پێکئینانا د ناڤبەرا خەلکی دا، وگۆتنا باشییێ، وهاریکاری، وچوونا مزگەفتێ بۆ کرنا نڤێژا ب جماعەت.

## حەدیسا بیست وحەفتێ

عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ -رضي الله عنه-، عَن النبي -صلى الله عليه وسلم- قال: ﴿ الْبِرُّ حُسْنُ الخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ ﴾ .

رواه مسلم

وعَنْ وَابِصَةَ بن معبد قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فَقَالَ: ﴿ جِئْتَ تَسْأَلُ عَنْ الْبِرِّ وَالْإِثْمِ؟ ﴾ قَلت: نَعَمْ، قال: ﴿ اسْتَفْتِ قَلْبَكَ، الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، واطْمَأَنَّ إِلَيْهِ القَلْبُ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ، وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ ﴾.

رواه أحمد

نەوواسێ کورێ سەمعانی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لی بن- گۆت: هەما قەنجی ئەخلاقێ باشە، وخرابی ئەو تشتە یێ د سنگێ تە دا بێت وبچت وتە پێ خۆش نەبت خەلک پێ ئاگەهدا بن. موسلم ڤەدگوهێزت، ووابصەیێ کورێ مەعبەدی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: ئەز هاتمە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وی گۆتە من: تو یێ هاتی پسیارا قەنجییێ دکەی؟ من گۆت: بەلێ، وی گۆت: پسیارا دلێ خۆ بکە، قەنجی ئەو تشتە یێ نەفسا تە ودلێ تە پێ رحەت ببت، وخرابی ئەو تشتە یێ د نەفسا تە دا بێت وبچت، و د سنگێ تە دا بگەرییێت، ئەگەر خۆ خەلک فەتوایێ بۆ تە بدەن ژێ.

ئەحمەد ڤەدگوهێزت

ئەڤە ژی ئێک ژ وان حەدیسانە یێن ب پەیڤێن خۆ ڤە گەلەکا کورت، و ب مەعنا وڕامانا خۆ ڤە یا درێژ، چونکی ئەو ب ڕەنگەکێ کورت قەنجی وخرابیێ بۆ مە ددەتە نیاسین، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- قەنجیێ وەک پەیڤەکا گشتی نیشا مە ددەت، کو هەمی ڕەنگێن باشیێ وکریارێن خێرێ د ناڤ خۆ دا ڤەدگرت، وخرابی ژی -کو ڕوییێ بەرانبەرە- پەیڤەکا گشتیە هەر نەباشیەکا هەبت ژ گۆتن وکریاران ڤەدگرت، و ژ بەر ڤێ چەندێ پێغەمبەری ئەو دانانە بەرانبەر ئێک.

قەنجی ئەوە مرۆڤ طاعەتێ خودێ بکەت، و د ئەمر وفەرمانێن وی دا بت، وسەرەدەریەکا باش د گەل بەنیان ژی بکەت، خودایێ مەزن د قورئانێ دا بەحسێ قەنجیێ دکەت ودبێژت: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧ ﴾ (البقرة: ١٧٧) یەعنی: باشی هەما کارێ وی کەسیە یێ باوەری ب خودێ ئینای وپەرستنا وی ب تنێ کری، وباوەری ب ڕۆژا دویماهیێ ئینای، و ب فریشتە وکیتابێن هاتینە خوارێ، و ب پێغەمبەران، ومال -د سەر حەژێکرنا خۆ ڕا بۆ وی- دایە مرۆڤێن خۆ یێن نێزیک، وئێتیمان، ووان هەژارێن فەقیریێ ئێخستین، ووان ڕێڤنگێن ژ مال ومرۆڤێن خۆ دویرکەفتین وموحتاج بووین، ووان خازۆکێن ژ بێ ڕێ نەچار بووین خواستنێ بکەن، ومال د ئازاکرنا بەنی وئێخسیران دا خەرج کری، و ب کرنا نڤێژێ ڕابووی، وزەکات دای، وئەوێن پەیمانێن خۆ ب جهـ دئینن، وئەوێ ل دەمێ هەژاری ونەخۆشیێ و ل دەمێ دژواریا شەڕی یێ بێفرەهـ. ئەوێن ب ڤی ڕەنگی ئەون یێن د باوەریا خۆ دا ڕاستگۆ، وئەو ئەون یێن خۆ ژ غەزەبا خودێ پاراستی کو خۆ ژ بێ ئەمریا وی دایە پاش.

ونیشانا قەنجیێ ئەوە دلێ مرۆڤی ل سەر کرنا وێ یێ رحەتە.

وخرابی یا کو ب شریعەت خودانێ خۆ هێژای عقووبێ دکەت، هەر کار وگۆتنەکە یا خودێ حەرام کری، وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا دو نیشانێن خرابیێ بۆ مە دەسنیشان کرن:

یا ئێکێ: دەمێ گۆتی: ﴿مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ﴾ وئەڤە نیشانەکا ناڤخۆییە، کو مرۆڤ د ناڤخۆییا خۆ دا هەست ب دودلی ونەخۆشیێ بکەت دەمێ وی کاری دکەت.

یا دووێ : ﴿وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ﴾ وئەڤە نیشانەکا دەرڤەییە، کو وی پێ خۆش نەبت خەلک پێ بحەسییێن کو وی ئەو کارێ کری، وشەرم ژ خۆ بکەت.

وئەگەر ئەڤ هەردو نیشانە د کارەکی دا کۆمبوون، دڤێت مرۆڤ خۆ ژێ بدەتە پاش، خۆ ئەگەر خەلک هەمی فەتوایێ ب وی تشتی بۆ بدەن.

وپێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا بهایێ ئەخلاقێ باش ژی نیشا مە ددەت، دەمێ دبێژت: هەما قەنجی هەمی ئەوە ئەخلاقێ مرۆڤی یێ باش بت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە قەنجی وخرابیێ ب مە ددەتە نیاسین.

٢- وئەو بهایێ فەتوایا دلی ژی د زانینا قەنجی وخرابیا تشتی ژی بۆ مە بەرچاڤ دکەت.

٣- تشتێ شریعەتێ خودێ وشریعەتێن بەنیان ژێک جودا دکەت ئەوە دەمێ مرۆڤ پێ ل شریعەتێ خودێ ددانت نەفسا مرۆڤی یا رحەت نابت.

٤- فەتوایا موفتیان تشتی بۆ مرۆڤی حەلال ناکەت ئەگەر مرۆڤ د دل دا بزانت ئەو تشت یێ دورست نینە.

## حەدیسا بیست وهەشتێ

عَنْ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ -رضي الله عنه- قَالَ: وَعَظَنَا رَسُولُ الله -صلى الله عليه وسلم- مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، وَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، وَذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، فَقلنا: يَا رَسُولَ الله، كَأَنَّهَا مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فأوصِنا، قَالَ: ﴿ أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى الله، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلاَفًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ، تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ ﴾.

رواه أبو داود والترمذي

عرباضێ کورێ ساریەی دبێژت: پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- وەعزەک ل مە کر، دل ژ بەر ترسیان، وچاڤان رۆندک باراندن، ئینا مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەر وەکی ئەو شیرەتا وییە یێ خاترا خۆ دخوازت، ڤێجا شیرەتەکێ ل مە بکە، وی گۆت: ئەز شیرەتێ ب تەقوایا خودێ ل هەوە دکەم، و ب گوهداریێ ئەگەر خۆ عەبدەکێ حەبەشی ببتە مەزنێ هەوە، وهەچیێ ژ هەوە بمینت دێ جودابوونەکا مەزن بینت، ڤێجا هەوە ئێمانەت سوننەتا من وسوننەتا جێگرێن من یێن سەرراست، وێ بگرن، وپدیێن خۆ ل سەر بشدینن، وهشیاری وان کاران بن یێن د دینی دا نوی دەردکەڤن، چونکی هەر تشتەکێ د دەینی دا نوی دەرکەڤت بیدعەیە، وهەر بیدعەیەکا هەبت بەرزەبوونە.

ئەبوو داوود وترمذی ڤەدگوهێزن

ڤێ حەدیسێ شیرەتەكا مەزن وكۆمكەر تێدا هەیە، ژ بەر كو وان هەمی تشتان ڤەدگرت یێن دین ودنیایا موسلمانان چێ دكەت، وئاشكەرایە كو پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- گەلەك جاران د ناڤ صەحابیێن خۆ دا ڕادبووڤە ووەعز ل وان دكر، وڕێكا دورست نیشا وان ددا، ئێك ژ وان جاران ئەڤ جارە بوو، یا كو وی وەعزەكێ وەسا تێدا ل وان كری، دلێن وان ژ ترسان دا ڤەلەرزین، وچاڤێت وان ڕۆندک باراندن، ووان وە هەست پێ كر كو ئەڤ شیرەت ووەعزە یێن وی كەسینە یێ خاترا خۆ ژ هەڤالێن خۆ دخوازت، لەو وان ڤیا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ڕێكێ بۆ وان ئاشكەرا بكەت، كانێ پشتی وی ئەو چ بكەن؟ وپێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- ژ لایێ خۆ ڤە شیرەتەک ل وان كر، مەسەلەیێن گرنگ یێن ئەو هەوجە دبنێ د ناڤ دا كۆمكرن، وئەم دشێین وان مەسەلەیان د ڤان خالان دا كۆم بكەین:

**تەقوایا خودێ:**

﴿ أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى الله ﴾ وتەقوا ئەوە مرۆڤ پەرژانەكی بێختە ناڤبەرا خۆ ووان تشتان یێن غەزەبا خودێ ب سەر وی دا دئینت، ومەبەست ب پەرژانی ئەوە ئەو وی كاری بكەت یێ خودێ فەرمان پێ كری، وخۆ ژ وی كاری بدەتە پاش یێ خودێ ئەو ژێ دایە پاش.. وتەقوا ئەو شیرەتە یا خودێ ل مرۆڤان كری، وئەوە دبتە ئەگەرا خێرا دنیایێ وئاخرەتێ، وبەری نوكە د حەدیسا (١٨) دا، مە بەحسێ تەقوایێ كریە، لەو پێتڤی ب دوبارەكرنێ ناكەت.

**گوهداریا مەزن وكاربدەستان:**

﴿ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا ﴾ یەعنی: وئەز شیرەتێ ب گوهداریا مەزنان ل هەوە دكەم، ئەگەر خۆ مەزنێ هەوە عەبدەكێ حەبەشی بت، وخودایێ مەزن د ئایەتەكێ دا دبێژت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ (النساء: ٥٩) وئەڤە ئەمرەكە خودێ ل هەمی خودان باوەران دكەت كو ئەو گوهداریا خودێ وپێغەمبەری بكەن، هەر وەسا گوهداریا

مەزنێن خۆ ژی بکەن یێن کارێ هەوە دکەڤنە د دەستان دا، ومەخسەد ب کاربدەستان د ئایەت وحەدیسێن ب ڤی ڕەنگی دا ئەون یێن کار شریعەتێ خودێ دکەن، وئەوێن ب ڤی ڕەنگی نەبن مەسەلا گوهداریا وان د کەفتە د بن مەسەلا (مەصلەحەت ومەفسەدەتێ) ڤە، وگوهداری ب ڕەنگەکێ گشتی دڤێت د وی کاری دا بت یێ خودێ پێ رازی بت، ئەگەر نە.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ﴿ لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الله عَزَّ وَجَلَّ ﴾ د بێ ئەمریا خودێ دا گوهداریا چو مەخلووقان نائێتەکرن.

**پێگیریا ب سوننەتێ:**

پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلاَفًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ، تَمَسَّكُوا بِهَا، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ ﴾ وئەڤە ئیشارەتەکا ئاشکەرایە ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کو ئوممەت پشتی وی دێ ژێک جودا بت، وگەلەک کۆم ودەستەکێن ڕێ بەرزە وسەرداچووی دێ پەیدا بن، وبەری صەحابی پسیار بکەن: کانێ ڕێکا ڕزگاربوونێ ل دەمێ پەیدابوونا ئختلافێ چیە؟ پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- بەرسڤ دا وان وگۆت: هەوە ئێمانەت سوننەتا من، ئەو ڕێ وڕێبازا ئەز ل سەر چوویم، ومن نیشا هەوە دای، هەر وەسا خەلیفێن من یێن سەرراست ژی ل سەر چووین.

ودەمێ پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژت: سوننەتا من ویا خەلیفێن من یێن سەرراست ب پدیان بگرن، وبشدینن، ئەڤە (کینایەتە) مەعنا وێ ئەوە مرۆڤ چو جاران سوننەتێ بەرنەدەت، وهەردەم خۆ پێڤە بگرت، خۆ چەند زەحمەتێ ب ڤێ چەندێ ڤە ببینت، وئەگەر هات ووی دەست نەمان خۆ پێڤە بگرت ژی بلا ئەو ب پدیان خۆ پێڤە بگرت. و ژ ڤێ چەندێ بۆ مە دیار دبت کو پێگیریا ب سوننەتێیە مرۆڤی دپارێزت، و ژ جودابوون وئختلافێ ددەتە پاش.

خۆدویرکرنا ژ بیدعەیان:

وپێگیریا ب سوننەتێ مەعنا وێ ئەوە مرۆڤ خۆ ژ بیدعەیان بدەتە پاش، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پشتی فەرمان ل مە کری ئەم کاری ب سوننەتێ بکەین، گۆت: ﴿وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾ یەعنی: هشیاری وان کاران بن یێن نوی دەردکەڤن، چونکی هەر تشتەکی -د دینی دا- نوی دەرکەڤت بیدعەیە، وبیدعە ئەو گۆتن وکریارەک، ورێ ورێبازن یێن پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د دینی دا دەردکەڤن، وچو ئەصل وبناخە بۆ نەهەین نە د کیتابێ دا ونە د سوننەتێ دا، وهەر تشتەکێ بیدعە بت سەرداچوون وضەلالەتە، بەرێ خودانی ددەتە ئاگری، وبەری نوکە د حەدیسا (٥) دا مە بەحسێ بیدعێ کربوو، لەو هەوجەی دوبارەکرنێ ناکەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ژ گۆتنا عرباضی بۆ مە دیار دبت کو وەعز وشیرەتێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هند کار ل صەحابیان دکر حەتا دلێن وان ڤەلەرزن وچاڤێن وان رۆندکان ببارینن، وئەڤە نیشانا باشیا وانە، خودێ ژ وان هەمیان رازی بت.

٢- حەدیس هندێ دگەهینت کو ژ تشێن باش ئەوە مرۆڤ شیرەتێ ب وی تشتی پێشکێشی خەلکی بکەت یێ مفایێ دنیا وئاخرەتا وان تێدا هەی، ب تایبەتی ل دەمێ خاترخواستن نێزیک دبت.

٣- وئەو دەلیلە ل سەر راستگۆیی‌یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د وان گۆتنان دا یێن وی بەحس ژێ کری وهێشتا چێ نەبووین، وکو ئەو ژ نک خۆ نەدئاخڤت، بەلکی ب وەحیا خودێ دئاخڤت، دەمێ گۆتیە صەحابیێن خۆ هەچیێ هەوە بژیت، یەعنی: عەمرێ وی درێژ بت، ئەو دێ ئختلافەکا مەزن بینت، وئاشکەرایە کو ل دویماهیا زەمانێ صەحابیان، هژمارەکا بیدعەیێن

عەقائدی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبوون، وەکی: بیدعەیا خەوارج وقەدەریان.. وگەلەک صەحابیان ب دەڤ ودەستێ خۆ بەرگریا وان بیدعەچیان کر.

٤- وحەدیس هندێ دگەهینت کو گوهداریا کاربدەستێن موسلمان کارەکێ واجبە ل سەر ئوممەتێ، ودەرکەفتنا ژ بن ئەمر وفەرمانێن وان ژ گونەهێن مەزنە، چونکی ئەو ڤەکرنە بۆ دەرگەهێ فتنێ.

٥- وئەڤ حەدیسە تەئکیدێ ل سەر پێگیریا ب سوننەتێ وخۆدویرکرنا ژ بیدعان دکەت، وئەو هندێ دگەهینت کو بیدعە هەمی ضەلالەتن، ووەسا نینە وەکی هندەک نەزان دبێژن: بیدعەیێن خراب ژی هەنە ویێن باش ژی، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دبێژت: هەمی بیدعە ضەلالەتن.

## حەدیسا بیست ونەهێ

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ –رضي الله عنه– قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ الله ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ؟ قَالَ: ﴿ لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ الله تَعَالَى عَلَيْهِ: تَعْبُدُ الله عَزَّ وَجَلَّ، وَلاَ تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ البَيْتَ ﴾ ثم قال: ﴿ ألا أَدُلُّكَ على أَبْوَابِ الخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِىءُ الخَطِيئَةَ كما يُطْفىءُ المَاءُ النارَ، وَصَلاةُ الرَّجُلِ في جَوْفِ اللَّيْلِ ﴾ ثم تلا: ﴿ تَتَجافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ المَضَاجعِ ﴾ حتى بلغ: ﴿ يَعْمَلُونَ ﴾ ثم قال: ﴿ ألا أُخْبِرُكَ برأسِ الأمْرِ وَعمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنامِهِ؟ ﴾ قلت: بلى يا رسول الله! قال: ﴿ رأسُ الأمْرِ الإِسْلامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الجِهادُ ﴾ ثم قال: ﴿ ألا أُخْبِرُكَ بِمَلاكِ ذلكَ كُلِّهُ ؟ ﴾ قلت: بلى يا رسول الله! فأخذ بلسانه ثم قال: ﴿ كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا ﴾ قلت: يا رسول الله! وإنا لمؤاخذون بما نتكلم به؟ فقال: ﴿ ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ في النَّارِ على وُجُوهِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟ ﴾.

رواه الترمذي

موعاذێ كورێ جەبەلی دبێژت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، كارەكی بۆ من بێژە، من ببەتە بەحەشتێ، ومن ژ ئاگری دویر بكەت، وی گۆت: تە پسیارا تشتەكێ مەزن كر، وئەو یێ ب ساناهیە ل سەر وی یێ خودێ ل سەر ب ساناهی كری: كو تو پەرستنا خودێ بكەی وچو شریكان بۆ وی نەدانی، و ب كرنا نڤێژێ رابی، وزەكاتێ بدەی، وڕۆژیا رەمەزانێ بگری، وبچیە حەجێ، پاشی گۆت: ئەرێ ئەز دەرگەهێن خێرێ نیشا تە

نەدەم؟ ڕۆژی پەرژانە، ودانا خێران گونەهێ ڤەدمرینت کا چاوا ئاڤ ئاگری ڤەدمرینت، ونڤێژا زەلامی ل نیڤا شەڤێ، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ حەتا گەهشتیە: ﴿يَعْمَلُونَ﴾، پاشی گۆت: ئەرێ ئەز بۆ نەبێژم سەرێ کاری وستوینا وی وکلۆڤانکا وی چیە؟ من گۆتێ: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، وی گۆت: سەرێ کاری ئیسلامە، وستوینا وی نڤێژە، وکلۆڤانکا وی جیهادە، پاشی گۆت: ئەرێ بۆ تە نەبێژم: چیە وێ هەمیێ دگرت؟ من گۆتێ: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئینا وی ئەزمانێ خۆ گۆت، وگۆت: بشێ ڤی، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ما حسێبا وی تشتی دێ د گەل مە ئێتەکرن یێ ئەم پێ دئاخڤین؟ وی گۆت: تو نەمینی! ما تشتەک هەیە مرۆڤان سەروسەر بهاڤێتە د ئاگری دا ئەگەر بەرهەمێ ئەزمانێ وان نەبت!

ترمذی ڤەدگوهێزت

گرنگیا ڤێ حەدیسێ ژ هندێ دئێت ئەو وان ئەگەران بۆ مە ئاشکەرا دکەت یێن مرۆڤی دبەنە بەحەشتێ، ووی ژ ئاگرێ جەهنەمێ دپارێزن، وئەڤە ئەو مەزنترین ئارمانجە مرۆڤ د ژینا خۆ یا دنیاییێ دا کاری بۆ دکەت.

**ئەگەرێن چوونا بەحەشتێ:**

صەحابیێ پێغەمبەری موعاذێ کوڕێ جەبەلی، و ژ بەر خەمخوارنا وی ژ زانینا کارێن چاک، پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کو ئەو وی تشتی بۆ بێژت یێ ببتە ئەگەر کو خودێ رەحمێ پێ ببەت، و ل ئاخرەتێ وی ببەتە بەحەشتێ؛ چونکی تشتەکێ ئاشکەرایە کەسەک ب کارێ خۆ ناچتە بەحەشتێ، وەکی د حەدیسەکا دی یا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هاتی: ﴿لَنْ يُدْخِلَ أَحَدَكُمْ عَمَلُهُ الجَنَّةَ﴾ یەعنی: کارێ ئێک ژ هەوە وی نابەتە بەحەشتێ.. بۆچی؟ چونکی هندی تو کاری بکەی، بلا چەند یێ باش بت، تو نەشێی حەقێ قەنجیێن خودێ ژ سەر خۆ ڕاکەی، ڤێجا چاوا دێ شێیی هندی

کاری کەی تو پێ بچیە بەحەشتێ؟ بەلێ ژ کەرەما خودێ د گەل بەنیان ئەوە وی ئەڤ کارە کرە سەبەب کو خودێ رەحمێ پێ ب خودانی ببەت. وەکی د ئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٧٢ ﴾ (الزخرف: ٧٢) یەعنی: ئەڤە ئەوە بەحەشتە یا خودێ ب رەحما خۆ هوین لێ دانایین ژ بەر وی کارێ باش یێ هەوە کری.

وئەڤ کارە یێ موعاذی پسیار ژێ کری، وەکی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، کارەکێ مەزنە، و ما چ تشت ژ وێ مەزنترە مرۆڤ وێ ئەگەرێ بزانت یا ئەو سەرکەفتنا مەزن پێ ب دەست خۆ ڤە دئینت، کو چوونا بەحەشتێ ودویرکەفتنا ژ ئاگریە؟ بەلێ ئەو کار، د گەل مەزنیا خۆ، کارەکێ ب ساناهیە بۆ وی یێ خودێ کەرەم د گەل کری، وبەرێ وی دایە هیدایەتێ، چونکی هیدایەت وتەوفیق د دەستێ خودێ دایە، ئەو وێ ددەتە وی یێ خۆ ژ هەژی کری.

و د بەرسڤێ دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەرێ موعاذی دا هەر پێنج ستوینێن سەرەکی یێن ئیسلامێ، کو دبنە ئەگەرا مەزن یا چوونا بەحەشتێ، وگۆتێ کو تو پەرستنا خودێ بکەی وچو شریکان بۆ وی نەدانی، وئەڤە ب کارئینانەکا عەمەلیە بۆ پەیڤا تەوحیدێ: (لا إله إلا الله، محمد رسول الله)، و ب کرنا نڤێژێ رابی، وزەکاتێ بدەی، ورۆژیا رەمەزانێ بگری، وبچیە حەجێ.. مەعنا: ب جهئینانا ستوینێن ئیسلامێ، وواجبێن دینی، دبتەئەگەرا چوونا بەحەشتێ، وەکی بەری نوکە ژی د هندەک حەدیساندا بۆری.

پاشی بۆ پتر فایدەی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دەرگەهێن خێرێ ژی نیشا صەحابیێ خۆ دان، هەر چەندە وی ئەو پیسار نەکربوو ژی، تشتێ هندێ دگەهینت کو یا باش ئەوە ئەوێ پسیار ژێ دئێتەکرن، دەمێ دبینت پسیارکەر یێ ئامادەیە بۆ وەرگرتنا زانینێ، ئەو زێدەتر ژ پسیارا وی بۆ بێژت، پشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بەرسڤا موعاذی دای، گۆتێ: ئەرێ ئەز دەرگەهێن خێرێ نیشا تە نەدەم؟

یەعنی: ئەوا مە گۆتی، ئەو تشتێن واجبن، یێن بێی وان خودان نەچتە بەحەشتێ، بەلێ پشتی چوونا بەحەشتێ، هندەک کارێن دی هەنە خێرن، دەرەجێن وی د بەحەشتێ دا بلندتر لێ دکەن، وجهێ وی خۆشتر لێ دکەن، وئەڤە ئەوکارن یێن ئەم دبێژینێ: سوننەت.

ئەو کار چنە؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئیشارەت دا سێ کارێن گرنگ، وگۆت: رۆژی پەرژانە، ودانا خێران گونەهێ ڤەدمرینت کا چاوا ئاڤ ئاگری ڤەدمرینت، ونڤێژا زەلامی ل نیڤا شەڤێ.. پاشی وی ئەڤ ئایەتە خواند ئەوا خودایێ مەزن تێدا مەدحێن وان دکەت یێن ب شەڤ گەلەک نەنڤن ژ بەر کرنا نڤێژێن شەڤێ: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾ حەتا گەهشتیە: ﴿ يَعْمَلُونَ ﴾.

وئیشارەت بۆ رۆژیێ ودانا صەدەقێ ونڤێژێ ل ڤێرێ، پتر بۆ یێن سوننەتە، وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ هەر کارەک ژ ڤان خێرەک ئاشکەراکر کو پێ دگەهتە مرۆڤی، رۆژی دبتە پەرژان وەکی مەتالی مرۆڤی ژ ئاگرێ جەهنەمێ دپارێزت، ودانا خێران وەسا گونەهان ڤەدمرینت وەکی ئاڤێ دەمێ ئاگری ڤەدمرینت، ومەخسەد ب گونەهان ل ڤێرێ گونەهێن بچویکە؛ چونکی گونەهێن مەزن هەوجەی تۆبێنە، ونڤێژێن شەڤێ ژی وەکی دانا خێران گونەهان ڤەدمرینت.

وپشتی ڤان هەر سێ کارێن خێر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سێ کارێن دی یێن گرنگ نیشا هەڤالێ خۆ دان، پشتی مەسە ب کرنا پسیارەکێ ل بەر وی شرینکری، وگۆتیێ: ئەرێ ئەز بۆ نەبێژم سەرێ کاری وستوینا وی وکلۆڤانکا وی چیە؟

موعاذی گۆتێ: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ!

وی گۆت: سەرێ کاری ئیسلامە، ومەبەست ب کاری ل ڤێرێ دینە.. یەعنی: هەما دین ئەوە تو خۆ ب دەست خودێ ڤە بەردەی، تەسلیمی وی

ببی، ونیشانا ژ هەمیان ئاشکەراتر یا تەسلیمبوونێ ئەوە مرۆڤ ب دەڤی ودلی شاهده بدەت.

وستوینا دینی نڤێژە، وکانێ چاوا بان بێ ستوینێئێتە ڕاگرتن، وەسا دین ژی بێ نڤێژ خۆ ناگرت.

وکلۆڤانکا دینی جیهادە، مەعنا: تو نابینی کارەک د دینی دا -پشتی فەرزان- ب خێرتر بت ژ کرنا جیهادا د ڕێکا خودێ دا.

ل دویماهییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەرێ ئەز بۆ تە نەبێژم ئەو چ تشتە وێ هەمییێ دگرت؟ یەعنی: ئەز بۆ تە دیار نەکەمکانێ ئەصل وبناخەییێ هەر تشتەکی، یێ کو مرۆڤی سەرڕاست دکەت، و ژ کەفتنێ دپارێزت، چیە؟

موعاذی گۆتێ: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ.

هنگی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەزمانێ خۆ گۆت، وگۆت: بشێ ڤی، یەعنی: هشیار بی ئەزمانێ خۆ بێ حسێب بەرنەدە، وبزانە تو چ دبێژی، دا ئەصلێ خێرێ هەمییێ ب دەست خۆ بێخی.. موعاذ ژ ڤێ چەندێ عەجێبگرتی بوو، وگۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ما حسێبا وی تشتی دێ د گەل مە ئێتەکرن یێ ئەم پێ دئاخڤین؟ ما ئاخفتنێن مە ژی ل سەر مە حسێب دبن؟

پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: تو نەمینی! یان دەیکا تەل سەر تە بکەتە گری! وهەر چەندە ئەڤ گۆتنە نفرینە ژی، بەلێ مەخسەدا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نفرین نەبوو، وهەما وی ئەو ئاخفتن گۆت، وەکی وان ئاخفتنێن بێ قەصد دئێنە سەر ئەزمانێ مرۆڤی، گۆت: ئەرێ ما تشتەک هەیە مرۆڤان سەر و سەر بهاڤێتە د ئاگری دا ئەگەر بەرهەمێ ئەزمانێ وان نەبت! یەعنی: هەما بەس ئەزمان وبەرهەمێ ویە، مرۆڤی دهاڤێتە د ئاگری دا، ئەزمانە مرۆڤی ب سەر دئێخت ووی سەرفەراز دکەت، وئەوە وی دئێخت وشەرمزار دکەت.

**مفاييّن حەدیسیّ:**

١- ژ پسیارا موعاذی ئاشکەرا دبت، کو د ناڤ صەحابیاندا هندەک هەبوون، خەم ژ زانینیّ دخوار، و حەز دکر پسیارا کاریّن چاک بکەن. هەر وەسا شیّوەییّ فیّرکرنا پیّغەمبەری -سلاڤ لیّ بن- بوّ صەحبیان ئاشکەرا دبت، وکانیّ چاوا وی ژ تشتیّ گرنگتر دەست پیّ دکر.

٢- خیّرا ستوینیّن دینی وواجبیّن شەرعی بوّ مە ئاشکەرا دبت، وکو ئەونمروّڤی دبەنە بەحەشتیّ و ژ ئاگری ددەنە پاش.

٣- هەر وەسا گرنگیا کاریّن خیّریّ ژی ییّن سوننەت، بوّ مە ئاشکەرا دبت.

٤- وحەدیس ئیشارەتیّ ددەتە گرنگیا ئەزمانی، وخەطەرا وی ل سەر مروّڤی، وکو ئەزمانە ژ هەر تشتەکیّ دی پتر خودانی دبەتە جەهنەمیّ.

## حەدیسا سیهێ

عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ -رضي الله عنه- قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله -صلى الله عليه وسلم-: ﴿ إِنَّ الله -عَزَّ وَجَلَّ- فَرَضَ فَرَائِضَ فَلاَ تُضَيِّعُوهَا، وَحَرَّمَ حُرُمَاتٍ فَلاَ تَنْتَهِكُوهَا، وَحَدَّ حُدُوداً فَلاَ تَعْتَدُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ غَيْرِ نِسْيَانٍ فَلاَ تَبْحَثُوا عَنْهَا ﴾.

حديث حسن رواه الدارقطني وغيره

ئەبوو ثەعلەبەیێ خوشەنی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هندی خودایێ مەزنە هندەک کارێن فەرز داناینە هوین وان بەرزە نەکەن، وهندەک تشت حەرام کرینە هوین پێ لێ نەدانن، وهندەک توخویب داناینە هوین وان نەبەزینن، وبەحسێ هندەک تشتان نەکریە، نە کو ژ بیر کریە، هوین ل وان نەگەڕیێن.

دارەقوطنی وهندەکێن دی ڤەدگوهێزن

**دەرەجا ڤێ حەدیسێ:**

زانایێن حەدیسێ حوکم ل سەر ڤێ حەدیسێ دایە کو ئەو یا ضەعیفە، ژ بەر دو ئەگەران، یا ئێکێ: مەکحوول ئەوێ ئەڤ حەدیسە ژ ئەبوو ثەعلەبەی ڤەگوهاستی، گوهـ ل وی نەبوویە، د گەل هندێ ژی گۆتیە: ( ژ ئەبوو ثەعلەبەی)، وئەڤە (تەدلیسە) وحەدیس پێ ضەعیف دبت. یا دووێ: وخیلاف د ناڤبەرا ریوایەتان دا هەیە، کانێ ئەڤە ژ گۆتنا ئەبوو ثەعلەبەیە،

یان ژی وی ئەو بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پالدایە. وهەر چاوا بت حەدیس یا (صەحیح) نینە.

**ئەحکامێن خودێ:**

وئەڤ حەدیسە ئەحکامێن خودێ ل سەر چار پشکان دئێنە لێکڤەکرن، و ب ڤی رەنگی:

١- فەرز: وئەڤە ئەو کارن یێن خودێ ل سەر بەنیێن خۆ لازم کری ئەو بکەن، وهەر گاڤەکا وان ئەو نەکر، ئەو دێ هێژای لۆمەکرنێ بن ل نیایێ، و ل ئاخرەتێ ژی دێ موستەحەقی عەزابێ بن، وەکی: نڤێژ و رۆژی وزەکاتێ.. وهندەک زانا ناڤێ: (واجب) ژی ل سەر ڤی کاری ددانن.

ئەڤە ئەو پشکە یا کو دڤێت ئەم سستیێ د کرنا واندا نەکەین، وزەعێ نەکەین؛ دا عەزابا خودێ ب سەر مە دا نەئێت.

٢- توخویب: ومەخسەد پێ هەر کارەکێ یێ خودێ دەستویری ب کرنا وی دابت، چ کرنا وی لازم کربت، وەکی پشکا بۆری، کو فەرزن، یان ژی کرنا وی ل بەر مە شرین کربت، وەکی کارێ سوننەت، یان ژی کرن ونەکرنا وی وەکی ئێک حسێب کربت، وەکی حەلالی.

ئەڤی دڤێت ئەم نەبەزینین ودەرباس نەکەین، یەعنی: ئەم پێ لێ نەدانین وبەر ب وی کاری ڤە بچین یێ خودێ دەستویری ب کرنا وی نەدای.

٣- حەرام: وئەڤە ئەو کارن یێن خودێ نەکرنا وان ل سەر مە لازم کری، وئاشکەرا کری کو هەچیێ وان بکەت، دێ هێژای لۆمەیا دنیایێ وعەزابا ئاخرەتێ بت، وەکی: کوشتنێ ودزیێ.. هتد.

وئەڤان کاران دڤێت ب چ رەنگان ئەم خۆ نێزیک نەکەین.

٤- ئەو تشتێ بەحس ژێ نەهاتیەکرن: ودڤێت نەئێتە هزرکرن کو خودێ ئەو ژ بیرکرینە، حاشا! خودێ تشتەکی ژبیر ناکەت، بەلێ هندەک تشت هەنە

وی بەحس ژێ نەکریە، نە ب حەلالی ونە ب حەرامی، ئەڤ کارێ هۆسا بت، مرۆڤ پێ عەفیکریە، ئەگەر بکەت پێ گونەهکار نابت، وئەگەر نەکەت ژی چو ل سەر نینە، وئەڤە دلۆڤانیەکە خودێ ب بەنییێن خۆ بری، ڤێجا بلا ئەو گەلەک ل دویڤ نەچن.

وئەڤ رەنگێ هە، دڤێت مرۆڤ ل دویڤ نەچت، وپسیار نەکەت، دا شک بۆ وی د کاری دا چێ نەبت، و د حەدیسەکێ دا یا موسلم ڤەدگوهێزت، هاتییە: ﴿هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ﴾، ومەخسەد ب (موتەنەطعان) ئەو کەسن یێن گەلەک ل دویڤ وان کاران دچن یێن مایێ وان تێ نەچت، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ئەڤە چوونە هیلاکێ.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەحکامێن خودێ بۆ بەنیان دانایان چار پشکن: فەرز، وحەرام، وتوخویب، ویێن بەحس ژێ نەهاتیەکرن.

٢- فەرزان دڤێت مرۆڤ سستیێ تێدا نەکەت، وحەرامی خۆ نێزیک نەکەت، وتوخویبی پێ لێ نەدانت، ویێ بەحس ژێ نەهاتیەکرن گەلەک ل دویڤ نەچت.

## حەدیسا سیھـ و ئێکێ

عَنْ سهلِ بنِ سعدٍ الساعدي -رضيَ الله عنه- قَالَ: جاءَ رجلٌ إلى النبي -صلى الله عليه وسلم- فقال: يا رسولَ الله، دلني على عملٍ إذا أنا عملته أحبني الله وأحبني الناس، فقَالَ: ﴿ ازهَدْ في الدُّنيا يحبّكَ الله وازهَدْ فيما في أيدي النَّاسِ يحبكَ الناسُ ﴾.

حديث حسن رواه ابن ماجه

سەهلێ كورێ سەعدێ ساعدی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: زەلامەک هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وگۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، کارەکی نیشا منبدە ئەگەر من ئەو کر، خودێ حەز ژ من بکەت، ومرۆڤ ژی حەز ژ من بکەن، گۆت: دلێ خۆ نەبە دنیایێ، خودێ دێ حەز ژ تە کەت، ودلێ خۆ نەبە وی تشتێ د دەستێ خەلکی دا هەی، مرۆڤ دێ حەز ژ تە کەن.

ئبن ماجە ڤەدگوهێزت

مەزنترین تشت مرۆڤ ب دەست خۆ دئێخت ئەوە خودێ حەز ژ مرۆڤی بکەت، هنگی ئاخرەتێ وی دێ یا ب سلامەت بت، وئەگەر خودێ تەوفیقا وی دا وڤیانا وی کرە د دلێن خەلکی ژی دا، ئەو خێرا ل سەر خێرێیە، چونكی ئەو د دنیایا خۆ ژی دا دێ یێ دلخۆش ورحەت بت، ڤێجا ئەو تشت چیە یێ ڤان هەردو باشیان ب دەست مرۆڤی ڤە دئینت؟ د ڤێ حەدیسێ دا صەحابیەک پسیارا ڤێ چەندێ ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکەت، وگرنگیا ڤێ حەدیسێ د ڤێ چەندێ دایە.

وپێغـەمبـەر -سـلاڤ لـێ بـن- د بـەرسـڤێ دا دو شـیرەتـێن مـەزن ل ڤـی هەڤالێ خۆ دکەت، ئەو ژی ئەڤەنە:

١- زوهدا د دنیایێ دا، ئەوا دبتە ئەگەرا هندێ کو خودێ حەز ژ مرۆڤـی بکەت.

٢- زوهدا د وی تشتی دا یێ د ناڤ دەستێ خەلکی دا هەی، ئەوا دبتـە ئەگەرا هندێ کو خەلک حەز ژ مرۆڤی بکەن.

ڤێجـا زوهـد چیـە؟ وچـاوا ئـەو ڤـێ خێـرا مـەزن ب دەسـت خـودانی ڤـە دئینت؟

دەمێ ئەم دبێژین: فلان کەس د فلان تشتی دا یێ زاهدە، یـەعنـی: ئـەو دلـێ خۆ نابـەتـە وی تـشتی، چونکی ئـەو تـشت ل نـک وی یـێ بـێ بهایـە، وتشـتـەک ل نـک مـرۆڤـی یـێ بـێ بـها نابت، حەتا مرۆڤ تشتەکێ دی یێ ژ وی ب بهاتر نەبینت، مەعنـا: دەمـێ کـەسـەک د دنیـایێ دا یـێ زاهد بـت، دلێ خۆ نابەتە دنیایێ، چونکی دنیا د چاڤێن وی دا یا کێمە، وکەنگی دنیـا دێ د چاڤێن وی دا یـا کـێم بـت؟ ئـەگـەر بـەرێ وی مـا ل تـشتەکـێ مـەزنتـر وچێتر ژ دنیایێ کو ئاخرەتە، وئەوێ ئاخرەت وی ژ دنیایێ موژیل بکەت، ئەو کەسەکە خودێ حەز ژێ دکەت.

وئـەو کـەسـێ زوهـدێ د وی تـشتی دا بکـەت یـێ د دەسـتێ خـەلکـی دا هەی، کو پەرتالێ دنیاییێیە، دڤێت بەرێ وی ل تشتەکێ دی یێ گرنگتـر بـت، کو پەرتالێ ئاخرەتێیە، ومرۆڤ ب تبیعەتێ خۆ حـەزژ وی کـەسـی دکـەن، یـێ ململانێ د گەل وان نەکەت د وی تشتی دا یێ ئەو حەز ژێ دکەن.

زانـایێ مـــەزن (شـــیخ الإســـلام ابـــن تیمیـــە) زوهـدێ ب ڤـــی ڕەنگـــی ددەتەنیاسین، دبێژت: زوهد ئەوە مرۆڤ وی تشتی بهێلت یێ ل ئاخرەتـێ چـو مفایی نەگەهینتەمرۆڤی، و وەرەع ئـەوە مـرۆڤ وی تـشتی بهێلـت یـێ مـرۆڤ بترستکول ئاخرەتێ زیانێ بگەهینتە مرۆڤی.

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە وێ رێکێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت یا ئەگەر ئەم لێ بچین خودێ حەز ژ مە بکەت، وخەلکی ژی حەز ژ مە بکەن.

٢- مرۆڤێ دلێ خۆ نەبەتە دنیایێ، خودێ حەز ژێ دکەت، ویێ دلێ خۆ نەبە وی تشتێ ل نک خەلکی هەی، خەلک حەز ژێ دکەن.. وئەڤە ئەو هەردو تشتن یێن خێرا دنیایێ وئاخرەتێ دگەهیننە مرۆڤی.

## حەدیسا سیهـ و دووێ

عَنْ أبي سعيد الخدري –رضيَ الله عنه– أن رسول الله –صلى الله عليه وسلم– قال: ﴿ لا ضَرَرَ ولا ضِرارَ ﴾.

حديث حسن رواه ابن ماجه وغيره

ژ ئەبوو سەعیدێ خودری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: بلا كەس زیانێ نەكەت، وكەس بەرسڤا زیانێ ژی ب زیانێ نەدەت.

ئبن ماجە ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە ئێك ژ مەزنترین بناخە و (قاعیدە) یێن ئوصوولی دەسنیشان دكەت، لەو ئەو ژی دئێتە هژمارتن ئێك ژ حەدیسێن گرنگ وكۆمكەر.. پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- تێدا ئاشكەرا دكەت كو ب چو رەنگان نابت زەرەر وزیان ژ مرۆڤێ موسلمان پەیدا ببت، ووەكی ئاشكەرا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د سیاقێ حەرامكرنا زیانێ دا دو پەیڤان ب كاردئینت: (ضرر) و(ضرار)، وزانا وشرۆڤەكەرێن حەدیسێ هژمارەكا جوداهیان د ناڤبەرا ڤان هەردو پەیڤان دا دەسنیشان دكەن، ئێك ژ وان ئەڤەیە: (ضرر) ئەو زیانە یا ل دەسپێكێ ژ كەسەكی پەیدا دبت، یەعنی: نابت بۆ مرۆڤێ موسلمان ئەو كارەكێ وەسا بكەت، زیان پێ بگەهتە كەسەكێ دی، و(ضرار) ئەو كارە یێ پشكداری تێدا هەبت، یەعنی: ئەو زیانە یا ژ دو كەسان پەیدا دبت، ومەخسەد پێ ئەوە دەمێ كەسەك كارەكی دكەت زیان پێ دگەهتە ئێكێ دی، بۆ یێ دی نابت ئەو ژی كارەكێ ب زیان بكەت؛ دا بەرسڤا زیانا یێ دی پێ

بدەت، مەعنا: زیان ب زیانێ نائێتە زڤڕاندن، وزەرەر ڕەنگەکێ زۆرداریێیە، وئاشکەرایە کو خودێ زیان حەرام کریە.

وزیان -کو د ئەصل دا دژی مفایە- دو ڕەنگێن وێ هەنە:

ئێک: دبت کەسەک کارەکی بکەت وئارمانجا وی پێ ئەو بت ئەو زیانێ پێ بگەهینتە خەلکی، وگومان تێدا نینە کو ئەڤە کارەکێ حەرامە.

دو: دبت ئەو کارەکی بکەت وئارمانجا وی ئەو نەبت زیان پێ بگەهتە کەسێ، بەلێ وەسا چێ ببت ژ بەر کارێ وی زیان پێ بگەهتە کەسەکێ دی، وئەو کارە ژی چێ نابت ویێ دورست نینە.

**بناخەیەکێ ئوصوولی:**

زانایێن ئوصوولێ بناخەیەکێ گشتی یێ گرنگ ژ ڤێ حەدیسێ وەردگرن، کورتیا وی ئەڤەیە: نابت بۆ کەسەکی کارەکێ وەسا بکەت زیان پێ بگەهتە ئێکێ دی، وئەگەر ئێکی کارەک کر زیان پێ گەهشتە ئێکێ دی، دڤێت ئەو بێتە خەرامەتکرن، ونابت بۆ وی یێ زیان گەهشتیێ، ڕابت بەرانبەر وێ چەندێ ئەو ژی زیانێ بگەهینتە یێ دی، بۆ نموونە: ئەگەر مرۆڤەکی کارەک کر بۆ ئەگەرا هندێ بیستانێ ئێکی خراب ببت، دێ ژێ ئێتە خواستن کو ئەو خەرامەتا یێ دی بدەت، نە کو یێ دی ڕابت ئەوژی بیستانێ یێ ئێکێ خراب بکەت؛ چونکی زیان ب زیانێ چارەسەر نابت.

وڤی بناخەیێ گشتی گەلەک چەق ژێ دچن، ژ وانبۆ نموونە: (زیان دڤێت نەئێتەکرن)، و(زیان ب زیانێ ڕانابت)، و(زیانا مەزنتر ب زیانا بچویکتر دئێتە لادان)، و(تەحەممولا زیانا تایبەت دئێتەکرن، دا زیانا گشتی پەیدا نەبت)، و(پالدانا زیانێ بەری ب دەستڤە ئینانا مفایی دئێت)، و(کەڤناتیا زیانێ وێ دورست ناکەت)..

و ژ ڤێ حەدیسێ ئاشکەرا دبت کو خودێ وی تشتی ژ مرۆڤی ناخوازت یێ زیانا وی تێدا هەبت، یەعنی: ئەگەر هات وکارەک ژ وان کاران یێن

خودێ ل سەر مرۆڤی فەرکرین بوو ئەگەرا هندێ زیانەک پێ بگەهتە وی، ئەو کار ژ وی نائێتە داخوازکرن، وەکی: مرۆڤەکی ئەگەر ئێشەک لێ هەبت، وخراب بت بۆ وی ئاڤێ ب کار بینت، سەرشویشتنا واجب ودەسنڤێژ ل سەر وی نابت، بەلکی ئەو دێ (تەیەمومێ) کەت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە بناخەیەکێ گرنگێ فقهی بۆ مە دەسنیشان دکەت، ئەوژی ئەڤەیە: زیان ژ کەسەکێ نائێتە قەبویلکرن.

٢- چێ نابت بۆ مرۆڤی کارەکی بکەت زیان پێ بگەهتە کەسێ، هەر وەسا چێ نابت ئەو بەرسڤا زیانێ ب زیانەکا دی بدەت.

٣- زیانەکا هەی یا حەقە، وەکی: ب جهئینانا (حدوودێن شەرعی)، بۆ نموونە: مرۆڤەک ئێکی بکوژت، ڤێجا دەسهەلات وی پێش یێ دی ڤە بکوژت، ئەڤە ناکەفتە دبن وێ زیانێ دا یا حەرام.

## حەدیسا سیھـ و سێیێ

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ – رَضِيَ الله عَنْهُمَا – أن رسول الله –صلى الله عليه وسلم– قال: ﴿لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لادَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمَاءَهُمْ، وَلَكِنَّ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾.

حديث حسن رواه البيهقي

ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گـۆت: ئەگەر ب گۆتنا مرۆڤان بێتەکرن، هندەک زەلام دێ داخوازا مال وخوینا هندەکان کەن، بەلێ دەعوەداری دڤێت نیشانەک هەبت، ویێ حاشاتییێ بکەت دڤێت سویند بخوت.

بەیهەقی ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە بناخەیەکێ گرنگ ژ بناخەیێن حوکمکرنا د ناڤبەرا خەلکی دا ددانت، دا ماف بێنە پاراستن، ودادی جهێ خۆ بگرت، وکەس ب هێجەتا وەرگرتنا مافێ خۆ پێ ل مافێ کەسەکێ دی نەدانت.. ژ بەر ڤێ چەندێ زانایێ مەزن (ابن دقیق العید) دگۆت: ئەڤ حەدیسە ئێک ژ بناخەیێن ئەحکامانە، ومەزنترین دەقە بۆ لێزڤرینێ دەمێ هەڤرکی پەیدا دبت.

وئەگەر حاکم ب گۆتنا خەلکی بکەت، بێی داخوازا دەلیلی ژێ بکەت، هەر کەسەک دێ وێ بێژت یا بۆ وی باش بت، ومفایێ وی تێدا بت، بەلێ ئەڤ چەندە نابت، پێتڤیە ل سەر وی کەسێ حوکمی د ناڤبەرا خەلکی دا دکەت، گوهداریا گۆتنا دەعوەداری ویا وی کەسێ دەعوە لێ دئێتەکرن بکەت،

پاشـی وێ تـەرازیـێ ب کـار بینـت یـا د ڤـێ حـەدیـسـێ دا هـاتی، کـو ژ دو پێگاڤان پێک دئێت:

یـا ئێکـێ: ژ بـەر کـو دەعـوەدار دەعوایـا تـشتەکـێ ڤـەشـارتی دکـەت، ودخوازت ئەو بۆ وی بکەڤت، دڤێت ئەو نیشانەکا ئاشکەرا ل سـەر گۆتنـا خـۆ بینـت، دا ئـەو بـۆ وی ببته دەلیل وهێجەتا موکم، هندێ بگەهینت کو ئـەو د ڤێ دەعوایا خۆ دا یێ ڕاستگۆیە، وئەگەر ئەو چو دەلیلان نـەئینـت، ئاخفتنا وی ب چو ناچت، ودێ حسێب بت مرۆڤـەکێ درەوین! ئـەڤـە دێ هنگـی بـت ئـەگـەر ئـەو کـەسێ دەعوا لێ دئێتەکرن حاشاتیێ ل گۆتنا دەعـوەداری بکـەت، ژ خـۆ ئـەگـەر حاشـاتی نـەکـر، هنگـی ژ دەعـوەداری نائێتـە خواسـتن ئـەو چـو دەلیلان بینت؛ چونکی ئعترافا هەڤڕکی باشترین دەلیلە ل سـەر ڕاسـتیا گۆتنـا وی.

یا دووێ: ئـەگـەر دەعـوەدار چـو دەلیـل نـەئینـان، ووی کـەسێ دەعـوا لـێ دئێتەکرن حاشـاتی ل گۆتنـا وی کـر، هنگـی حـاکم دێ داخـوازێ ژ وی کـەسـی کەت یێ دەعوا لێ هاتیەکرن کو سویند بخوت، ڤێجا ئەگەر وی سویند خـوار، مەسەلا وان دێ ب دویماهی ئێت.

و ژ ڤێ چەندێ دیار دبت کو دەلیلێ دەعـوەداری بـەری یـێ هـەڤڕکـێ وی دئێـت، و ل دۆر دەسنیـشـانکرنا دەلیلـی وکـانێ ئـەو چیـە؟ بـەلگـەنامـەیـە، یانشاهدە، یان سویندە د گەل شاهدی؟ ئـەڤـە مـەسـەلـەکە جهـێ وێ کتێبێن فقهێیە، ومە نەڤێت ل ڤێرێ ب بەرفرەهی ل سەر باخڤین.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- نابت بـۆ حـاکمی ب گۆتنـا دەعـوەداری بکـەت، حـەتـا ئـەو دەلیلـەکێ موکم ونیشانەکا ئاشکەرا ل سەر گۆتنا خۆ بینت.

٢- ئەگەر دەعوەداری چو دەلیل نەبن، لایـێ بـەرانبـەر کـو ئـەو یـێ دەعـوە لێ دئێتەکرن، دڤێت سویند بخوت.

٣- هەردو لا (دەعوەدار ویێ دەعوە لێ دئێتەکرن) دڤێت ژ خودێ بترسن، وبزانن کو حوکمێ حاکمی تشتێ حەرام بۆ وان حەلال ناکەت، وحوکمێ خودێ د سەر هەر تشتەکی ڕایە.

٤- حاکم ژی دڤێت ژ خودێ بترست، وحوکمی نەدەت حەتا حەقی بۆ ئاشکەرا نەبت، ودڤێت ئەو بزانت کو نەدادیا د حوکمی دا ئێک ژ گونەهێن مەزنە، یێن خودانێ خۆ هێژای ئاگرێ جەهنەمێ دکەن.

## حەدیسا سیهـ و چارێ

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري – رَضِيَ الله عَنْهُ – قال: سَمِعْتُ رَسُولَ الله –صلى الله عليه وسلم– يَقُولُ: ﴿ مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ ﴾.

رواه مسلم

ژ ئەبوو سەعیدێ خودری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- دگۆت: هەچییێ ژ هەوە خرابییەک دیت بلا ئەو وێ ب دەستێ خۆ بگوهۆڕت، وئەگەر نەشیا بلا ئەو وێ ب ئەزمانێ خۆ بگوهۆڕت، وئەگەر نەشیا بلا ئەو وێ ب دلێ خۆ بگوهۆڕت، وئەو لاوازترین باوەریە.

موسلم ڤەدگوهێزت

**ئەگەرا ڤەگوهاستنا حەدیسێ:**

دەمێ مەروانێ کورێ حەکەمێ ئەمەوی والی ل مەدینێ، جارەکێ دەرکەفتەنڤێژا جەژنێ، وبەری ئەو دەست ب نڤێژا جەژنێ بکەت، ئەو ڕابوو دا ب سەر مینبەرێ بکەڤت، وخوتبێ بخوینت، ئەبوو سەعیدێ خودری هنگی یێ ئامادە بوو، وگاڤا ئەبوو سەعیدی ئەڤ کارە ژێ دیتی، کراسێ وی گرت وکێشا دا ب سەر مینبەرێ نەکەڤت، بەلێ وی خۆ ژ ناڤ دەستان ئینادەر و ب سەر مینبەرێ کەڤت، ودەست دا خوتبێ.. ئەبوو سەعیدێ گۆتێ: ب خودێ هەوە مەسەلە گوهاڕت! وی گۆت: بابێ سەعیدی، ئەوا تە دزانی چوو! ئەبوو

سەعیدێ گۆتێ: ب خودێ ئەوا ئەز دزانم چێترە ژ وێ یا ئەز نەزانم، مەروانی گۆت: ئەگەر ئەم پشتی نڤێژێ خوتبێ بخوینین کەس ناڕوینت گوهێ خۆ بدەتە مە، لەو مە ئەو ئینا بەری نڤێژێ.. هنگی ئەبوو سەعیدی ئەو حەدیسە د ناڤ خەلکی دا گۆت.

### حوکم وڕێکێن گوهاڕتنا خرابیێ:

ژ ئایەتێن قورئانێ وحەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئێتە زانین کو فەرمانا ب باشیێ وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ، تشتەکێ فەر وواجبە ل سەر موسلمانان، وهەر جارەکا موسلمانان خۆ ژ ڤی کاری دا پاش، خودێ عەزابەکا دژوار دێ ب سەر وان دا ئینت، وەکی د وێ حەدیسێ دا هاتی یا ئیمامێ ترمذی ژ حوذەیفەی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ﴿ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْ عِنْدِهِ، ثُمَّ لَتَدْعُوُنَّهُ فَلاَ يَسْتَجِيبُ لَكُمْ ﴾ یەعنی: ئەز ب خودێ کەمە یان هوین دێ فەرمانا ب باشیێ وباشڤەبرنا ژ خرابیێ کەن، یان نێزیکە خودێ عەزابەکێ ژنک خۆ ب سەر هەوە دا بهنێرت، پاشی هوین دێ دوعایان ژوی کەن وئەو د بەرسڤا دوعایا هەوە نائێت.

بەلێ ئەڤ واجبێ هە هندەک جاران ل سەر هەمی کەسان واجب دبت، وهندەک جاران ل سەر هندەکان واجب دبت، ئەگەر هندەک پێ ڕابوون گونەهـ ژ سەر هەمیان ڕادبت.. و د مەسەلا ڕاکرن ونەهێلانا خرابیێ دا هەمی کەس وەکی ئێک نینن، هەر ئێکی خودێ ل دویڤ شیانا وی دێ لێ گرت، بۆ نموونە: مرۆڤێ حوکم د دەستی دا بت، بارێ وی گرانترە ژ یێ خەلکێ دی یێ چو حوکم د دەستی دا نەبت، ومرۆڤێ زانا بت، بارێ وی گرانترە ژ مرۆڤێ عامی ونەزان.. وهۆسا. وڕێک ومەرتەبەیێن گوهاڕتنا خرابیێ ژی هەمی وەکی ئێک نینن، وحالێ مرۆڤان ژی د دەر حەقێ دا وەکی ئێک نابت، ژ وان ڕێک ومەرتەبەیان یێن کو د حەدیسێ دا هاتین:

١- گوهارتنا ب دەستی:

وئەڤە پتر دکەفتە سەر ملێ کاربدەستان؛ چونکی دەسهەلات یا وانە، وچی کارێ وانبڤێت ئەو دشێن بکەن، بەلێ مەعنا ڤێ ئەو نینەکەسەک ژ بلی وان نەشێت ڤێ چەندێ بکەت.. نەخێر! هەر کەسەکێ بشێت خرابیێ ب دەستێ خۆ بگوهۆڕت، بێی کو خرابیەکا مەزنتر بێتە شوینێ، دڤێت ئەو ڤێ چەندێ بکەت.

٢- گوهارتنا ب دەڤی:

وئەڤە پتر دکەفتە سەر ملێ زانایان؛ چونکی ئەو دینی دزانن، ودشێن حەقیێ ونەحەقیێ ل بەر خەلکی ئاشکەرا بکەن.

٣- گوهارتنا ب دلی:

وکەس ژ ڤێ نائێتە عەفیکرن؛ چونکی ئەو ب هەمی کەسان ڤە دئێت، وهەر چەندە بەرهەمێ ڤێ رێکێ گەلەک یێ کێمە ژی، بەلێ ئەو ژ هەر کەسەکی دئێتە خواستن، وئەوێ ب ڤی رەنگی ژی خرابیێ نەگوهۆڕت، یەعنی: ب دلی ژی کەرب ژ خرابیێ ڤەنەبت، ئەوی چو باوەری ل نک نەمایە، لەو عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی دگۆت: ((ئەوێ چوویە هیلاکێ یێ ب دلی باشی وخرابیێ نەزانیبت)).

وفەرە ئەو کەسێ فەرمانا ب باشیێ وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ دکەت، بەری هەر تشتەکی ب کارێ خۆ، نە ب گۆتنێ ب تنێ، بۆ خەلکی ببتە جهێ چاڤلێکرنێ، چونکی خودێ حەز ژ وی کەسی ناکەت یێ وی تشتی بێژت یێ ئەو ب خۆ نەکەت، بەلێ مەعنا ڤێ چەندێ ئەو نینە ئەو کەسێ باشیەکێ نەکەت دڤێت بەرێ خەلکی نەدەتە وێ باشیێ، یان ئەو کەسێ خرابیەکێ دکەت خەلکی ژ وێ خرابیێ نەدەتە پاش.. نەخێر! کانێ چاوا کرنا باشیێ کارەکێ فەرە، وەسا فەرمانا ب باشیێ ژی کارەکێ فەرە، هەر وەسا نەکرنا خرابیێ ژی.

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ئـەڤ حـەدیـســـە هـنـدێ دگەهینت کو فەرمانا ب باشیێ وپاشڤەبرنا ژ خرابیێ ژ باوریێیە.

٢- پاشڤەبرنا ژ خرابیێ، ونەهێلانا وی کاری یێ شریعەتـی حـەرامکری، کارەکێ واجبە، بەلێ وی چەند مەتەبە بۆ هەنە، هەر ئێک ل دویڤ مەرتەبەیا خۆ دڤێت پێ رابیت، ئەگەر نە خرابیەکا مەزنتر دێ پەیدا بت.

٣- ژ کارێ ئەبوو سەعیدی دیار دبت کو گوهۆرینا خەلەتییێن کاربدەستان ب دەستی بـۆ وی یـێ پێڤـە بێـت، کـارەکـێ دورسـتە، بـەلـێ دەرکـەفتنـا ژ بـن حوکمێ وان ژ بەر خەلەتییێ، وراکرنا چەکی دژی وان، خرابیێن مـەزنتـر پێڤـە دئێت، لەو د هندەک حەدیسێن دی دا هاتیە کو ئەو کار چێ نابت، هندی ئەو کوفرا ئاشکەرا بەلاڤ نەکەن.

## حەدیسا سیھـ و پێنجێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رَضِيَ الله عَنْهُ – قال: قَالَ رَسُولُ الله –صلى الله عليه وسلم–: ﴿ لاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ الله إِخْوَانًا. المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَا هُنَا ﴾ وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ﴿ بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ ﴾.

رواه مسلم

ژ ئـەبـوو هورەیرەی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: حەسویدیێ ب ئێک دو نەبەن، وئێک ودو نەخاپینن، وکـەربێ نەهاڤێنە ئێک ودو، وپشت نەدەنە ئێک ودو، وهندەک ژ هەوە فرۆتنێ د سـەر فرۆتنا هندەکان ڕا نەکەن، وبەنیێن خودێ بن وبراییێن ئێک بن، موسلمانبراییێ موسـلمانیە، نـە زۆرداریـێ لـێ دکـەت، ونـە وی شـەرمـزار دکـەت، ووی ناشکێنت، تەقوا ئەها د ڤێرێ دایە -وسێ جاران ئیشارەت دا سنگێ خۆ- تێرا مرۆڤی خرابی هەیە ئەو برایێ خۆ یێ موسلمان کێم بکەت، موسلمان هەمی ل سەر موسلمانی حەرامە: خوینا وی، ومالێ وی، وناموسا وی.

موسلم ڤەدگوهێزت

ڤێ حـەدیسـێ گـەلـەک مفـاییێن مـەزن تێدا هـەنـە، چـونکی ئـەو بـەرێ موسلمانان ددەتە وێ ڕێکێ یا باشیا وان تێدا هەی، ڕێکا براینیێ، وبەرێ وان ژ گەلەک ڕێکێن خراب ددەتە پاش یێن دبنە ئەگەرا پەیدابوونا نەڤیان

ودلمـانێ دناڤبـەرا وان دا، هـەر وەسـا ئـەو ئاشـكەرا دكـەت كـو خـوين ومـال وناموبسا موسلمانى ژى ل سەر موسلمانى حەرامە..

**دلرەشى وحەسويدى:**

حەسويدى ئەوە دلێ مرۆڤى د دەر حەقا برايێ وى دا هند يێ رەش بت، كو حەز بكەت ئەو قەنجى ونعمەتا خودێ د دەل وى كرى نەمينت، وئەڤە كارەكێ حەرامە ونە ژ ئەخلاقێ مرۆڤێ موسلمانە، بەلكى ئەو ئەخلاقێ ئبليسيە ئەوێ حەسويدى ب ئادەمى برى، وبۆ نەچوويە سوجوودێ. ئەڤە وئەگەر مرۆڤ قەنجيەكێ ل نك ئێكى ببينت، ڤێجا حەز بكەت ئەو ژى وەكى وى بت، وئەو قەنجى د گەل وى ژى بێتەكرن، ئەڤە دورستە ونابتە حەسويدى.

**خاپاندن:**

ڤێجا چ د رەنگەكێ كرين وفرۆتنێ دا بت، يێ كۆ دبێژنێ: (نەجەش) وەكى هندەك زانا ڤێ حەديسێ پێ شەرح دكەن، يانهەر رەنگەكێ حيلە وخاپاندنێ بت، ئەڤە حەرامە ونابت مرۆڤێ موسلمان بكەت.

ونەجەش د كرين وفرۆتنێ دا ئەوە كەسەك پەرتالێ خۆ بۆ فرۆتنێ پێشكێش بكەت، ئێك بچت ژ قەستا بهايەكێ مەزن پێ بدەت، بێى ئنيەتا كرينێ هەبت، بەلكى ب تنێ ئارمانجا وى ئەو بت بهايى ل سەر خەلكى بلند بكەت.. وئەڤە رەنگەكێ فێلبازى وخاپاندنێيە، لەو يێ حەرامە.

**كەرب ونەڤيان:**

ئيسلام گەلەك بەرێ مە ددەتە ڤيانێ، ودخوازت وان ئەگەران ل نك مە پەيدا بكەت يێن ڤيانێ د ناڤبەرا مە دا زێدە دكەن، ومەعنا ڤێ ئەوە كەرب ونەڤيان تشتەكێ دورست نينە، وهەر تشتەكێ دبتە ئەگەرا بەلاڤبوونا كەرب ونەڤيانێ د ناڤبەرا مە دا، يێ حەرامە، ودڤێت ئەم خۆ ژێ بدەينە پاش، دا ڤيانا مە بۆ ئێك ودو بمينت.

**پشتدان وسلبوون:**

ئەگەر نەڤیان پەیدا بوو، پشتدان وژێک سلبوون ژی دێ پەیدا بت، وئەو ژی کارەکێ حەرامە، وئاشکەرایە کو سلبوون ئەگەر ژ سێ ڕۆژان زێدەتر بوو، دێ کەفتە د حەرامییێ دا، وەسا نەبت ئەوسەرا تشتەکێ شەرعی بت.

**فرۆتنا ل سەر فرۆتنێ:**

ومەخسەد پێ دو کەسەک کڕین وفرۆتنەکێ بکەن، وهێشتا وان معاملا خۆ ب دویماهی نەئینای، ئێکێ دی بچت خۆ بکەتە د ناڤ ڕا، دا معاملا وان خراب بکەت، وئەو تشتەکێ خۆ بفرۆشتە وی بکڕی، یان ژی ئەو وی تشتی ژ بائعی بکڕت.. ئەڤە حەرامە؛ چونکی دبتە ئەگەرا پەیدابوونا کەرب ونەڤیانێ.

وبەرانبەر ڤان کارێن نەدورست پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- بەرێ مە ددەتە کارەکی خێرێ هەمییێ د ناڤ خۆ دا دگرت، کو براینیە، ئەو براینیا هندەک حەقان ل سەر خودانی فەر دکەت، وەکی کو ئەو زۆرداریێ ل برایێ خۆ نەکەت، و د گەل وی یێ ڕاستگۆ بت، بهایێ وی کێم نەکەت، و ب چاڤەکێ نزم بەرێ خۆ نەدەتێ، وپێ ل وان مافێن وی نەدانت یێن خودێ داینێ وەکی کو خوین ومال ونامویسا وی پاراستی بمینت.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- حەدیس ئیشارەتێ ددەتە هندک ژ وان کارێن حەرام یێن کو نابت موسلمان د گەل موسلمانی بکەت.

٢- تەقوا د دلی دایە، وکەس ب دلی یێ زانا نینە ژ بلی خودایێ مەزن، ڤێجا بلا کەس مەدحێنخۆ ب تەقوایێ نەکەت.

٣- ئیسلام باوەری وموعامەلەیە، عیبادەت وئەخلاقە، گۆتن وکریارە.

## حەدیسا سیهـ و شەشێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رَضِيَ الله عَنْهُ – قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله –صلى الله عليه وسلم–: ﴿ مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ الله عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ الله عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ الله فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَالله فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ الله لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهَّ يَتْلُونَ كِتَابَ الله وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ الله فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ ﴾.

رواه مسلم

ژ ئـەبـوو هورەیرەی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەچیێ دژواریەکێ ژ دژواریێن دنیایێ ژ سەر خودان باوەرەکی راکـەت، خـودێ دژواریـەکـێ ژ دژواریـێن قیامـەتـێ دێ ژ سـەر وی راکـەت، وهەچیێ ل سەر مرۆڤەکێ تەنگاڤبکەتە بەرفرەهی، خودێ ل دنیایێ وئاخرەتێ دێ ل سەر وی کەتە بەرفرەهی، وهەچیێ موسلمانەکی ستارە بکەت، خودێ ل دنیایێ وئاخرەتێ دێ وی ستارە کەت، وخودێ هاریکارێ عەبدیە هندی عەبد هاریکارێ برایێ خۆ بت، وهـەچیـێ رێکـەکێ بگـرت دا زانینـەکێ بخـوازت، خودێ ب وێ چەندێ رێکەکێ بۆ بەحەشتێ دێ ل بەر وی ب ساناهی ئێخت، وهەر کۆمەکا ل مالەک ژ مالێن خودێ رویننە خوارێ، کیتابا خودێ بخوینن ونیشا ئێک ودو بدەن، رحەتی دێ ب سەر وان دا ئێت، ودلۆڤانی دێ وان ڤەگرت، وملیاکەت دێ ل دۆرا وان بن، وخودێ دێ بـەحسێ وان ل نک وان

ملياكەتان كەت ئەوێن ل نك وی، وهەچییێ كارێ وی وی ڤـەهێلـت، نـەسـەبـا وی وی پێش نائێخت.

موسلم ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە كۆمەكا زانین وقاعیـدە وتـۆرەییـێن گرنـگ نیـشا مـە ددەت، دا ئەم كاری پێ بكەین، ژ وان:

**بەرفرەهكرنا ل سەر خەلكی:**

ڤێجا چ مرۆڤ ب دەستێ خۆ د هەوارا كەسەكی بچـت، ووی ژ نـەخۆشـی ودژواریەكێ بینتە دەر، یان ل سەر سڤك بكـەت، یـان ژ ب مـالێ خـۆ هـاری وی بكەت ووی ژ تەنگاڤیەكێ بینتەدەر.. ئەوێ ڤێ چەندێ بكەت خودێ ژی ل دنیایێ وئاخرەتێ دێ ل سەر وی كەتە فرەهی، ووی ژ تەنگاڤیان ئینتەدەر.

**ستارەكرنا موسلمانان:**

گومان تێدا نینە كو چو مرۆڤ نینن دبێ كێماسی بن، وكەسەك نینە یێ بێ گونەهـ ژی بت، وهەر ئێك ژ مە هند عـەیب هـەنـە كـو ئـەگـەر خـودێ وان ئاشكـەرا بـكـەت شـەرمـا وی پێ د ناڤ خەلكی دا بچت، وچونكی ئـەصـل د مرۆڤـێ موسـلمان دا ئـەوە وی ئـەو بـۆ برایـێ خـۆ بڤێـت یـێ بـۆ خـۆ دڤێـت، دەمێ ئەو عەیب وكێماسیەكێ ل نك برایەكێ خۆ ببینت، وی سـتارە بكـەت، وشـەرمـا وی پـێ د ناڤ خەلكی دا نەبەت، وهنـدەك كـەس هـەنـە هـزر دكـەن ب هێجەتا رەخنـەگرتنـێ یـان شـیرەتكرنـێ وان مـافێ هـەی عـەیبـێن خـەلكی ئاشـكەرا بكـەن، وئـەو ب خـۆ وەسـا نینـە، هـەتكبـرن تـشتەكـە ورەخنـەگـرتن وشیرەتكرن تشتەكێ دیە!

وكانێ چاوا پێتڤیە مرۆڤ برایێ خۆ ستارە بكەت، وعـەیبـێن وی د نـاڤ خەلكی دا بەلاڤ نەكەت، یا پێتڤیتر ئەوە -وەكی ئاشكەرا- كو مرۆڤ گونەهـ وعەیبێن خۆ ب خۆ ژی ڤەشێرت وژێ تۆبە بكەت وئاشكەرا نەكەت.

### هاریکاریا خەلکی:

وهەر چەندە بەری نوکە حەدیسێ بەحسێ رەنگەکێ هاریکاریێ کربوو، کو مرۆڤ برایەکێ خۆ ژ تەنگاڤییێ بینتەدەر، بەلێ حەدیس ل ڤێرێ بەحسێ هاریکاریێ ب رەنگەگێ گشتی دکەت، کو مرۆڤ د خێرا برایێ خۆ دا بت، ووی کاری بۆ وی بکەت یێ مفایێ وی تێدا بت.. ئەوێ ب ڤی رەنگی بت، خودێ ژی دێ هاریکاریا وی کەت، وئەوێ خودێ ل هاری بت ئەو تێرا وی هەیە.

### خواستنا علمی:

ب تایبەتی وی علمی یێ ل ئاخرەتێ مفایی دگەهینیێ، وئاشکەرایە کو علم ل مرۆڤی ناگەرییێت دڤێت مرۆڤ ل علمی بگەرییێت، وئەو کەسێ ڤێ زەحمەتێ بدەتە بەر خۆ، و ل علمی بگەرییێت، خودێ کارێ وی دێ ب سناهی ئێخت، ودێ وی علمی دەتێ یێ بەرێ وی ددەتە رێکا بەحەشتێ، یان ژ بەر داخوازا وی بۆ علمی، خودێ بەرێ وی دێ دەتە هیدایەتێ، ئەوا دبتە ئەگەرا چوونا وی بۆ بەحەشتێ.

### خێرا خواندن ونیشادانا قورئانێ:

وعلمێ ژ هەمیان مەزنتر، علمێ قورئانێیە، لەو حەدیسێ د دویڤ دا ئیشارەت دا وان مرۆڤان یێن ل مزگەفتێ کۆم دبن، وقورئانێ دخوینن ونیشا ئێک ودو ددەن، چار خێرێن مەزن وەکی پێغەمبەرەی -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا دکەت، خودێ ددەتەڤان کەسان:

١- خودێ تەناهی ودلرحەتییێ ددەتە وان، لەو ئەو هەست ب خۆشیا دلی دکەن.

٢- رەحم ودلۆڤانی ژ نک خودێ ب سەر وان دا دئێتە خوارێ.

٣- ملیاکەت ل دۆرا وان کۆم دبن، ودوعاییێن خێرێ بۆ وان دکەن.

٤- خودێ، ب هەمی مەزنیا خۆ ڤـە، بـەحسێ وان ب باشـی ل نـک وان ملیاکەتان دکەت، ئەوێن ل نک وی.. وبەسە بۆ مرۆڤی سەرفەرازی کو خـودێ بەحسێ وی بکەت.

**جزا ب کاریە نە ب نەسەبێ:**

وئەڤە ئێک ژ گرنگترین تەرازیێن ئیسلامێیە بۆ کێشانا مرۆڤـان، بهـایێ مرۆڤی د وی کاری دایە یێ ئەو دکەت، وهەر ئێک جزایێ خۆ ل دویڤ کـارێ خۆ وەردگرت، نە کو ل دویڤ بنەمال ونەسەبا خۆ، وئەوێ کـارێ وی یـێ بـاش وی پێشڤە نـەبەت، نـەسـەبـا وی قـەت وی پێشڤە نابـەت، وهـەر ژ بـەر ڤـێ چەندێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دگۆتــە مـرۆڤێن خـۆ یـێن نێزیـک: هـوین ب کارێ خۆ یێ باش خۆ ژ خودێ بکڕن، ئەز چو مفایی ناگەهینمە هەوە!

**مفایێن حەدیسێ:**

١- خێرا هاریکاریا مرۆڤێن تەنگاڤ وبێ رێ گەلەکە.

٢- هەر وەسا خێرا ستارەکرنا مرۆڤێ موسلمان.

٣- دڤـێـت ئـەم ل وان رێکا بچین یێن علم پێ ب دەست مـە دکـەڤت، ب تایبەتی علمی قورئانێ.

٤- حەدیس خێرا کۆمبوونا ل مزگەفتێ بۆ خواندن وخۆفێرکرنا قورئانێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت.

٥- جزایێ هەر ئێکی ل دویڤ کارێ وی دئێتەدان، وئەگەر کارێ وی یـێ باش نەبت، فایدێ وی ناکەت ئەو ژ بنەمالەکا باش بت.

# حەدیسا سیە و حەفتێ

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ – رَضِيَ الله عَنْهُما – عَنْ رَسُولِ الله –صلى الله عليه وسلم– فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، قَالَ: ﴿ إِنَّ الله كَتَبَ الحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ: فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا الله عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا الله عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا الله عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا الله سَيِّئَةً وَاحِدَةً ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ خودایێ خۆ ڤەگوهاست، گۆت: هندێ خودێیە باشی وخرابی نڤیسینە، پاشی ئەو ئاشکەرا کرن: ڤێجا هەچییێ دلێ خۆ ببەتە باشیەکێ ووێ نەکەت، خودێ دێ وێ ل نک خۆ نڤیست باشیەکا تمام، وئەگەر وی دلێ خۆ برێ وکر، خودێ وێ ل نک خۆ دێ نڤیست دەهـ خێر، حەتا حەفت سەدان، وگەلەک پتر، وئەگەر وی دلێ خۆ برە خرابیەکێ ونەکر، خودێ دێ وێ ل نک خۆ نڤیست خێرەکا تمام، وئەگەر دلێ خۆ برێ وکر، دێ بۆ وی نڤیست گونەهەکا ب تنێ.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە قەنجیا خودێ یا مەزن ودلۆڤانیا وی یا بەرفرەهـ بۆ مە بەرچاڤ دکەت، وکانێ ئەو چەند د خێرا بەنیێن خۆ دایە، بەرێ خۆ بدەنێ

کانێ حەدیس دبێژت: خودێ دێ بۆ وی **ل نک خۆ** نڤیست.. ل نک خۆ، ئەڤە ئیشارەتەکە بۆ گرنگیدانا خودێ ب کارێ عەبدی، وقەدرێ عەبدی یێ بلند ل نک خودێ، ئەگەر ئەو بزانت!

وحەدیس ئیشارەتێ ددەتە چار ڕەنگێن کاران:

ئێک: کرنا باشییێ:

ئەو مرۆڤێ باشیەکێ بۆ خودێ دکەت، وئارمانجا وی پێ خێر بت، خودێ وێ باشییێ بۆ وی کێم کێم ب دەهان دنڤیست، وبۆ وی یێ وی بڤێت زێدەتر لێ دکەت، حەتا دگەهتە حەفت سەدان، وپتر ژی.. وئایەتێن قورئانێ ژی ب ڤێ مەعنایێ هەنە.

دو: کرنا خرابیان:

وئەوێ خرابیەکێ بکەت، خودێ خرابیەکا وەکی وێ بۆ دنڤیست، یەعنی: ئێکا ب تنێ.. بەلێ هندەک جاران ژ بەر پیرۆزیا جهی ودەمی گونەهـ مەزنتر لێ دئێت، وەکی وی یێ ل حەرەمێ بێ ئەمریا خودێ بکەت. ژ بەر هندێ هندەک صەحابیان -وەکی عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی- حەز نەدکر ل حەرەما مەکەهێ ئاکنجی ببن، دگۆتن: گونەهـ ل وێرێ مەزنترە.

سێ: دلبرنا باشییێ:

کو مرۆڤ دلێ خۆ ببەتە کرنا باشیەکێ، پاشی تشتەکێ نە ب دەستێ وی چێ ببت، نەهێلت ئەو وی کاری بکەت، وەکی وی یێ دەمێ دڤێت ئنیەتا خۆ بینت کو ب شەڤێ ڕابت نڤێژێن سوننەت بکەت، پاشی د خەو بچت وهشیار نەبت، خودێ خێرەکا تمام دێ بۆ وی نڤیست.

چار: دلبرنا خرابییێ:

کو دلێ وی بچتە کرنا خرابییێ، وبێتە سەر هزرێ کو بکەت، پاشی لێڤە ببت ونەکەت، خودێ خێرەکا تمام دێ بۆ وی نڤیست، بەلێ ئەگەر وی دلێ

خـۆ بـره كـرنـا خرابيەكێ وكارێ خۆ ژى كر دا ئەو وێ خرابيێ بكەت، پاشـى -بێى وى- تشتەكێ وەسا چێبوو ئەو نـەشيا وێ خرابيـێ بكـەت، هـەر چـەنـدە وى حەز دكر بكەت، هندەک زانا دبێژن: ئەڤى گونەهەک دێ بۆ ئێتە نڤيسين، چونكى هەر وەكى وى ئەو كرى، مادەم كارێ خۆ كر دا بكەت.

و د روايەتا (موسلمى) دا دەمى بەحسێ نڤيسينا گونـەهـەكێ دئێتـەكرن پێ خرابيێ دكەت، ئەڤزێدەيى هەيە: ﴿ وَمَحَاهَا الله، وَلاَ يَهْلِكُ عَلَى الله إِلاَّ هَالِكٌ ﴾

يەعنى: ئەگەر وى دلێ خۆ برە خرابيێ وئەو كر، خودێ خرابيـەكـا ب تنـێ دێ بۆ وى نڤيست، وئەگەر ڤيانا دێ بۆ وى ژێ بەت! وپشتى ڤێ رەحما بەرفرەهـ وڤێ هەمى دەليڤەيا بۆ مرۆڤان هاتيەدان، هەمـا ئـەو كـەس دێ چتـە هيلاكـێ پێ هيلاک بۆ خۆ هلبژارتى، ومفا ژ ڤێ هەمى دلۆڤانييێ نەديتى.

**مفايێن حەديسێ:**

١- رەحمـا خـودێ يـا بـەرفـرەهـ وڤـەنجيـا وى يـا مـەزن ژ ڤـێ حـەديسـێ ئاشكەرا دبت.

٢- ژ كەرەما خودێ د گـەل بـەنيـان ئـەو خێـرێن وان زێدە دكـەت، بـەلـێ گونەهێن وان زێدە ناكەت.

٣- مرۆڤ دلێ خۆ ببـەتـە باشييێ، پاشى وەسـا چـێ نـەبت ئـەو بكـەت، خێرەک دێ بـۆ وى ئێتـە نڤيسين، بـەلـێ ئـەگـەر وى دلـێ خـۆ بـرە خرابيـەكـێ پاشى بەرى كرنێ لێڤەبوو، خێرەک دێ بۆ ئێتە نڤيسين.

٤- ژ ڤـێ حـەديسـێ دئێتـە زانـين كـو ئـەو ملياكـەتـێن كـارێ مرۆڤـى دنڤيـسن، خـودێ ئاگـەهـداريا وان ب وێ هـزرێ دكـەت يـا د دلـێ مرۆڤـى دا دگەڕيێت، دەربارەى كرنا باشييێ وخرابييێ.

## حەدیسا سیه و هەشتێ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – رَضِيَ الله عَنْهُ – قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله –صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ–: ﴿ إِنَّ الله قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ ﴾.

رواه البخاري

ژ ئەبوو هورەیرەی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هندی خودێیە دبێژت: هەچییێ نەیارەتیا وەلیەکێ من بکەت، من شەڕ د گەل وی ڕاگەهاند، وبەنییێ من ب تشتەکی خۆ نێزیکی من نەکریە خۆشتڤیتر بت ل نک من ژ وی تشتی یێ من ل سەر وی فەرزکری، وبەنییێ من هەر دێ مینت خۆ نێزیکی من کەت ب کرنا سوننەتان، حەتا ئەز حەز ژ وی دکەم، ڤێجا ئەگەر من حەز ژ وی کر، ئەز دێ بمە گوهێ وی یێ وی پێ گوهـ لێ دبت، وچاڤێ وی یێ ئەو پێ دبینت، ودەستێ وی یێ ئەو پێ دگرت، وپێیێ وی یێ ئەو پێ ب ڕێڤە دچت، وئەگەر ئەو پسیارێ ژ من بکەت ئەز دێ دەمێ، وئەگەر خۆ ب من بپارێزت، ئەز دێ وی پارێزم.

بوخاری ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە بهایێ مرۆڤێن قەنج ل نک خودێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، وکو حەرامە نەیارەتیا وان بێتەکرن، هەر وەسا بهایێ عیبادەتێ چ یێ فەرز

بت چ سوننەت بۆ مە ئاشکەرا دکەت، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ژ خودایێ خۆ ڤەدگوهێزت، کو هەر کەسەکێ نەیارەتیا وەلیەک ژ وەلیێن خودێ بکەت، خودێ دێ شەڕی د گەل وی کەت، وئەوێ خودێ شەڕێ وی بکەت، مسۆگەر ئەو دێ چتە هیلاکێ.

ووەلیێن خودێ، وەکی خودێ ب خۆ د ئایەتەکێ دا ددەتە زانین، دو سالۆخەتێن سەرەکی ل نک هەنە، دبێژت: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۝٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ۝٦٣ ﴾ (یونس: ٦٢-٦٣) مەعنا: سالۆخەتێ وان یێ ئێکێ باوەریە، ویێ دووێ تەقوایە، ووان چو نیشانێن تایبەت نینن وان ژ خەلکی جودا بکەن، وەکی جلکان یان سەر وبەری، ودڤێت نەئێتە هزرکرن کو وەلیێن خودێ د مەعصوومن وچو گونەهان ناکەن، یان مەرتەبا وان د سەر یا پێغەمبەران ڕایە، وەکی هندەک نەزان هزر دکەن!

ودوژمناتیا وەلیێن خودێ کارەکێ حەرامە، ئەگەر هات وئەڤ دوژمناتیە سەرا هندێ بت چونکی ئەو فەرمانا خودێ ب جه دئینت، بەلێ ئەگەر سەرا تشتەکێ دی یێ دنیایێ بت، ژ وان تشتێن هەڤڕکی سەرا چێ دبت، ئەو ناکەفتە د بن ڤی حوکمی ڤە، ودەمێ خودێ دبێژت: (فقد آذنته بالحرب) مەعنا وێ ئەوە: من ب وی دا زانین کو ئەز دوژمنێ ویمە ودێ شەڕێ وی کەم.. وشەڕێ خودێ د گەل ئێکی مەعنا وێ تێبرنا ویە.

وباشترین کارێ مرۆڤ خۆ پێ نێزیکی خودێ بکەت، ئەو کارن یێن وی ل مرۆڤی فەرز کرین، وەکی: نڤێژێن فەرز، ورۆژیا ڕەمەزانێ.. وبەلکی خۆ نەکرنا کارێن حەرام ژی د ڤێ چەندێ دا وەکی کرنا کارێن فەرز بت.

پشتی فەرزان سوننەت دئێن، ودەرگەهێ سوننەتان یێ بەرفرەهە، بۆ وی یێ بڤێت قەست بکەتێ، وکرنا سوننەتان وەکی ژ ڤێ حەدیسێ دئێتە زانین دبتە ئەگەر کو خودێ حەز ژ خودانی بکەت، وئەگەر خودێ حەز ژ ئێکی کر، بەرەکەتا ڤێ حەژێکرنێ ل سەر ژیانا وی ئاشکەرا دبت، وخودێ بۆ وی دبتە هاریکار وپشتەڤان، وئێکا هند ژ وی چێ دکەت ئەو ب گوهێ خۆ گوهداریا

تشتەکی نەکەت، ئەو تشت تێ نەبت یێ خودێ حەز ژێ دکەت، و ب چاڤێ خۆ بەرێ خۆ نەدەتە تشتەکی، ئەو تشت تێ نەبت یێ خودێ حەز ژێ بکەت، ودەست ناکەتە تشتەکێ خودێ پێ خۆش نەبت، و ب پیێ خۆ ژی ئەو ب نک تشتەکی ڤە ناچت، ئەو تشت تێ نەبت یێ خودێ حەز ژێ بکەت.. ودەمێ خودێ دبێژت: ئەز دێ بمە گوهێ وی، وچاڤێ وی.. وهتد، ئەڤە کنایەتە ژ هندێ کو خودێ دێ ڤان ئەندامێن وی پارێزت، دا ئەو کارەکێ وەسا پێ نەکەت خودێ پێ خۆش نەبت.

وتشتێ دی یێ خودێ ددەتە وەلییێ خۆ ئەڤەیە: هەر پسیار ودوعایەکا ئەو ژ خودێ بکەت، خودێ د بەرسڤا وی دئێت، وچی گاڤا وی خۆ ب خودێ پاراست خودێ دێ وی پارێزت.

**مفاییێن حەدیسێ:**

١- وەلی حورمەتا خۆ هەیە، ودڤێت نەیارەتیا وی نەئێتەکرن.

٢- ئەوێ کەرب ونەڤیانێ بۆ وەلییێنخودێ هەل دگرت، ئەویێ ل سەر خەطەرەکا مەزن؛ چونکی خودێ نەیارێ ویە.

٣- کارێ سوننەت بەری یێ فەرز نائێتەکرن.

٤- ئەوێ فەرزان ب جه بینت، وسوننەتان ژی بکەت، ڤیانا خودێ ب دەست خۆ دئێخت، وئەوێ خودێ حەز ژێ بکەت ژیانەکا ب بەرەکەت دبەتە سەری.

## حەدیسا سیهـ و نەهێ

عَنْ ابْنِ عَبَّـاسٍ - رَضِيَ الله عَـنْهُما - قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ الله -صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ-: ﴿ إِنَّ الله تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ ﴾.

رواه ابن ماجه والبيهقي

ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هندی خودێیە خەلەتی، وژبیرکرن، وکوتەکی لێ کرن، بۆ من ژ سەر ئوممەتا من ڕاکریە.

ابن ماجە وبەیهەقی ڤەدگوهێزن

وئەڤ حەدیسە ژی زێدە یا گرنگە؛ چونکی ئەو قاعیدەیەکێ فقهی یێ مەزن بنەجهـ دکەت.. زانایێ ناڤدار ئبن حەجەرێ هەیتەمی دبێژت: مفایێ ڤێ حەدیسێ یێ گشتیە، چونکی ئەو بەحسێ سێ تشتان دکەت، هەر سێ دکەڤنە د هەمی (ئەبوابێن فقهی) دا، وگەلەک جاران چێ دبن، لەو ب کێر دئێت بۆ بێتە گۆتن: نیڤا شریعەتی، چونکی کار وکریارێن مرۆڤی، یان ب قەصد ژێ دەردکەڤن، وبیرا وی لێ دئێتەڤە، وئەڤە ئەوە یا (عەمد) بت د گەل هلبژارتنێ، یان ژی وی چو قەصد پێ نینە ووی نەهلبژارتیە، وئەڤە یان خەلەتیە یان ژبیرکرنە یان کوتەکی یا لێ هاتیەکرن، و ژ پەیڤێن ڤێ حەدیسێ دئێتە زانین کو سەرا ڤێ پشکا دووێ ل مرۆڤی نائێتەگرتن، و ژ مەفهوومێ وێ دئێتەزانین کو پشکا ئێکێ ل مرۆڤی دئێتەگرتن، مەعنا: (مەنطووقێ) حەدیسێ نیڤەکا شریعەتی ڤەدگرت، و(مەفهوومێ) وێ نیڤەکێ.

وبەرفرەهکرنا ڤێ گۆتنێ ب ڤی ڕەنگیە:

ئەو كار وگۆتنێن ژ مرۆڤێ موكەللەف پەیدا دبن، ئێک ژ دووانە:

یا ئێكێ: ئەو دزانت چ دكەت و چ دبێژت، و ب دلێ خۆ ئەو وێ گۆتنێ دبێژت ووی كاری دكەت، یەعنی: ئەو كار وگۆتنە یێ (قەصد) و (ئختیار) تێدا هەی ژ لایێ مرۆڤی ڤە، وئەڤی ڕەنگی د دنیایێ دا مرۆڤ دێ پێ ئێتەگرتن، و ل ئاخرەتێ ژی حسێبا وی دێ د گەل ئێتەكرن..

یا دووێ: ئەو كار یان گۆتن یا ژ بێ (قەصد) و (ئختیار) ژ مرۆڤی پەیدا دبت، ئەوە یا ئەم دبێژینێ: بێ دەستی.. وئەڤە ئێک ژ سێیانە:

١- خەلەتی: وئەڤە ئەو كار وگۆتنن یێن (ئختیار) تێدا هەی، بەلێ مرۆڤی (قەصد) پێ نینە، وەكی: مرۆڤ ستێركا خۆ ل حەیوانەكی بگرت، وێ گاڤێ مرۆڤەک بێت وخۆ بهاڤێتە، وبێتە كوشتن.. ئەڤ كارە وی ب دلێ خۆ یێ كری وهلبژارتی، بەلێ مەخسەدا وی پێ كوشتنا وی مرۆڤی نەبوو.

ئەڤی كاری گونەه تێدا نینە، بەلێ ئەو یێ بەرپسیارە ژ كارێ خۆ، لەو هندەک شوینوارێن كارێ وی دكەڤنە ستویێ وی دا، وەكی دانا خوینێ بۆ نموونە.. وئەڤە ژ بەر هندێیەدا مرۆڤ یێ ل خۆ هشیار بت، ودا مافێن خەلكی ژی زەعێ نەبن.

٢- ژبیركرن: وئەڤە ژی ئەو كار وگۆتنن یێن مرۆڤی نە ب (قەصد) دكەت، وەكی: مرۆڤێ ب ڕۆژی، دەمێ ژبیرا وی دچت كو یێ ب ڕۆژیە، ڤێجا ڕابت تشتەكی بخوت.

ئەڤی چو ل سەر نینە، نە گونەه، ونە شوینوارێن كارێ وی، لەو ئەم دبێژینە ڤی: ڕۆژیا تە یا دورستە، وچو گونەه ژی ل سەر تە نینە.

٣- كوتەكی: یەعنی: كەسەک ئێكی مەجبوور بكەت كو ئەو كارەكی یان گۆتنەكێ بكەت، وبێژتێ: ئەگەر تو ڤی كاری نەكەی دێ تە كوژم، یان ئەندامەكێ لەشێ وی ژێڤەكەت.. وەكی: مرۆڤەک گەفێن كوشتنێ ل ئێكێ بكەت، ئەگەر ئەو ئاخفتنا كوفرێ نەبێژت.

و د مەسەلا کوتەکیێ دا دو پشک هەنە:

پشکا ئێکێ: کوتەکیا د گۆتنێ دا، یەعنی: ئێک کوتەکیێ ل ئێکی بکەت کو ئەو گۆتنەکا نە یا دورست بێژت، گۆتنا کوفرێ بت یان کێمتر.. جمهوورێ زانایان دبێژن: ئەڤە چو گونەهـ ل سەر نینە.

پشکا دووێ: کوتەکیا د کریاران دا (کوشتن تێ نەبت)، وئەڤی ژی گونەهـ ل سەر نینە، بەلێ کارێ هندەک شوینوارێن کریارا وی دکەڤنە ستویێ وی یان نە، ئەڤێ بەرفرەهی بۆ هەیە، د کتێبێن فقهی دا بەحس ژێ دئێتەکرن..

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو ئەو کار یان گۆتنا مرۆڤ ب دلێ خۆ نەکەت، و(قەصد وئختیار) تێدا نەبت، چو گونەهـ ل سەر نینە.

٢- ئەو کار وگۆتنێن مرۆڤ بێ قەصد دکەت سێنە: خەلەتی، ژبیرکرن، کوتەکی.

عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ - رَضِيَ الله عَنْهُما - قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- بِمَنْكِبِي، فَقَالَ: ﴿ كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ ﴾ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: إِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ المَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ، وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ.

رواه البخاري

ژ عەبدللاهێ کورێ عومەری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ملێ من گرت، وگۆت: تو د دنیایێ دا وەکی مرۆڤێ غەریب یان یێ رێڤنگ بە. وعەبدللاهێ کورێ عومەری دگۆت: ئەگەر ل تە بوو ئێڤار تو ل هیڤیا سپێدێ نەبە، وئەگەر ل تە بوو سپێدە تو ل هیڤیا ئێڤاری نەبە، وتو دەمێ ساخلەمیا خۆ بەری نساخیێ ژ دەست نەکە، ودەمێ ژیێ خۆ بەری مرنا خۆ.

بوخاری ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە بناخەیە د مەسەلا زوهدا د دنیایێ دا، کو مرۆڤ دلێ خۆ نەبەتە دنیایێ، وخۆ پێ پشتڕاست نەکەت، چونکی گەلەک کەس هەنە ڤیانا دنیایێ دلێن وان دئێختە داڤێن خۆ، ووان ژ چوونا بەر ب خودێ ڤە گیرۆ دکەت، یان لێڤە دکەت!

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا رێکێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، رێکا دەرباسبوونا ژ ڤێ دنیایێ ب سلامەتی، گۆت: ئەگەر تە بڤێت

ب سلامەتی ژ ڤێ دنیایێ دەرکەڤی تو وەکی مرۆڤێ غەریب بە، یان ژی وەکی مرۆڤێ رێڤنگ.. ویەیڤا (یان) ل ڤێرێ نە بۆ گومانێیە، بەلکی ئەو بۆ هلبژارتن و ب سەرکەفتنێیە.. دبێژت: د دنیایێ دا وەکی مرۆڤێ غەریب بە، وئەم دزانین مرۆڤێ غەریب ئەگەر چەند ل جهەکێ خۆش ژی بت، ئەو یێ رحەت نابت، چونکی ئەو یێ ل جهەکی وی کەسێ خۆ لێ نینە، لەو د نەفسا خۆ دا یێ شکەستیە، ورەنگەکێ ترسێ ل نک هەیە.. بەلێ چونکی مرۆڤێ غەریب ژی دبت هندەک جاران ل وەلاتێ غوربەتێ ئاکنجی ببت، وهزر بکەت ئەو بۆ خودان جهـ، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- مەسەلە پتر بەر ب پێشڤە بر، وگۆت: یان ژی ژ ڤێ ژی چێتر تو وەکی مرۆڤێ رێڤنگ بە، رێڤنگ ئەوێ د جهەکی را دبۆرت، دا قەستا وەلاتێ خۆ بکەت، ئەگەر ئەوجهـ چەند یێ خۆش ژی بت، خۆشیەکا دورست وتمام پێ نابەت، چونکێ ئەو دزانت ئەڤ خۆشیە یا بەروەختە.

ویشتی عەبدللاهێ کورێ عومەری ئەڤ حەدیسە بۆ مە ڤەگێڕای، وی ژی شیرەتەک ل مە کر وگۆت: هزر نەکە دنیا مالا تەیە، تو رێڤنگی، هەر دەمەکی چاڤەرێ بە تو بۆ وەغەرێ بێیە گازیکرن، لەو گاڤا تو گەهشتیە سپێدێ ل هیڤیا ئێڤاری نەبە، وگاڤا ل تە بۆ ئێڤار ژی تول هیڤیا سپێدێ نەبە.

وحەتا تو پەشێمان نەبی دەمێ تو بۆ وەغەرێ ئێیە گازیکرن، تو دەمێ خۆ باش ئستغلال بکە.. ونەهێلە تشتەک ژێ بێ فایدە ژ دەست تە دەرکەڤت، دەمێ تو یێ ساخلەم، کاری بکە، چونکی تو نزانی بەلکی دەمەک ب سەر تە دا بێت، دلێ تە بچتە کاری، بەلێ تو یێ نساخ بی، ڤێجا تو نەشێی چو بکەی، وهندی تو د ژیانێ دا بی، دەمێ خۆ زەعێ نەکە، چونکی گاڤا مرن گەهشتە تە ئێکی تە چو دەلیڤە نابن تو کارەکی بکەی.

ڤێجا ئەو عەبدێ خودێ خێرا وی ڤیا بت، ئەوە یێ ژ غەفلەتێ هشیار دبت، ودنیایێ بۆ خۆ دکەتە جهێ چاندنا تۆڤێ ئاخرەتێ.

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە بەرێ مە ددەتە زوهدا د دنیایێ دا، وكو ئەوە رێكا رزگاربوونا ب سلامەت.

٢- ئەوێ بڤێت ژ دنیایێ بێتەپاراستن، دڤێت خۆ د دنیایێ دا وەسا حسێب بكەت كو كەسەكێ غەریبە یان رێڤنگە.

٣- دڤێت مرۆڤ هشیاری دەمێ خۆ بت، ووی ژ قەستا زەعێ نەكەت، چونكی دەم د دەستێ مرۆڤی دا وەكی قالبێ بەفرێیە، هێدی هێدی دحەلییێت بێی مرۆڤ پێ بحەسییێت، هەما هند دبیت ئەو خلاس وچو ژێ نەما.

عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرو - رَضِيَ الله عَنْهُما – قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-: ﴿ لا يُؤمِنُ أَحدُكُم حتّى يكونَ هَواهُ تَبَعاً لِما جِئتُ بِهِ ﴾.

حديث حسن صحيح رويناه في كتاب الحجة

ژ عەبدللاهێ کورێ عەمری -خودێ ژێ رازی بت- دبێـژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئێک ژ هەوە باوەرییێ نائینت حەتا ڤیـان ودلچوونێن وی ل دویڤ وێ بن یا ئەز پێ هاتیم.

حەدیسەکا باش ودورستە مە د کتێبا (الحجة) دا ڤەگوهاستیە

**ئەڤ حەدیسە:**

ب ڤـی رەنـگی ئیـمامـێ نەوەوی ڤـێ حـەدیسـێ ڤـەدگـوهێزت، وحوکمی ب دورستییێ ل سـەر ددەت، ووی ئـەو ژ کتێبـا (الحجة علی تـارکي سلوک طـریق المحجة) ڤەگوهاستیە، وەکی ئەو ب خۆ دبێژت، وئـەو کتێب ژ دانانـا (أبو الفتح نصر بن إبراهيم المقدسی)یە، بەلێ زانایێن حـەدیسـێ د گـەل وی نیـنن د ڤـی حوکمی دا، بـەلکـی وان حـوکم ب (ضـەعیفـی)یـێ ل سـەر ڤـێ حەدیسێ دایە، وئەگەرێن لاوازیا حەدیسێ زانایێ ناڤدار (ابن رجب) د کتێبـا خۆ (جامع العلوم والحکم) دا ڤەدگێرت.

**شەرتێ باوەریا تمام:**

ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو مـرۆڤ نابتـە خودانێ بـاوەریـەکا تمـام حـەتا ڤیان ودلچوونێن وی ل دویڤ وی شریعەتی بن یێ پێغـەمبـەرێ خودێ

-سلاڤ لێ بن- پێ هاتی، ژ حەلالی وحەرامی، وئەمر ونەهیان، یەعنی: حەتا ئەو دلێ خۆ ل دویڤ شریعەتی دبەت.. نە وەکی هندەک کەسان ئەوێن دڤێن شریعەتی ل دویڤ هەوایێ نەفسا خۆ ودلچوونێن خۆ ببەن!

و د گەلەک جهان دا مەعنایەکا وەکی ڤێ د قورئانێ دا هاتیە، وەکی ڤێ ئایەتێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ (النساء: ٦٥) مەعنا: ئەی موحەممەد، باوەریا وان تمام نابت حەتا ئەو ب حوکمێ تە رازی نەبن د وی تشتی دا یێ د ناڤبەرا وان دا چێ دبت، ونە بەس ئەورازی ببن، بەلکی وان ب دلی ژی پێ خۆش بت، وئەو خۆ بۆ تەسلیم بکەن.

وئەڤە نیشانا ڤیانا دورستە، ئەوێ حەز ژ خودێ وپێغەمبەری بکەت، و د ڤیانا خۆ دا یێ ڕاستگۆ بت، دڤێت دویکەفتنا وان بکەت، و ب حوکمێ وان یێ رازی بت.. وبەرانبەر ڤێ چەندێ: ئەوێ ل دویڤ شریعەتی نەچت، وهندەک بیدعەیان ل دینی زێدە کەت، مەعنا ئەو د ڤیانا خۆ دا بۆ خودێ وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ ڕاستگۆ نینە.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ یا دی دا، یا ئەبوو داوودێ ژێ ڤەدگوهێزت، دبێژت: ﴿ مَنْ أَحَبَّ لله وَأَبْغَضَ لله وَأَعْطَى لله وَمَنَعَ لله فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ ﴾ هەچیێ ڤیان ونەڤیان ودان ونەدانا وی بۆ خودێ بت، ئەو وی باوەری تمام کر.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە شەرتێ باوەریا تمام بۆ مە بەرچاڤ دکەت.

٢- دڤێت مرۆڤ د هەمی حالێن خۆ دا، ڤیان ودلچوونێن خۆ ل دویڤ شریعەتێ خودێ ببەت.

## حەدیسا چل و دووێ

عَنْ أنس – رَضِيَ الله عَنْهُ – قَالَ: سمعت رَسُولَ الله –صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ– يقولُ: ﴿ قالَ الله: يا ابنَ آدمَ، إنَّك ما دعوتَني ورجوتَني غَفَرْتُ لَكَ على ما كانَ فيكَ وَلا أبالي، يا ابنَ آدمَ، لَو بلغتْ ذنوبُك عَنانَ السماءِ، ثمَّ استغفرْتَني، غَفَرتُ لَكَ، يـا ابنَ آدمَ، إنك لو أتَيتَني بقُرابِ الأرضِ خَطايا، ثُمَّ لقيتَني لا تشركُ بي شيئاً لأتَيتـك بقُرابِها مَغْفِرةً ﴾.

رواه الترمذي

ژ ئەنەسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێـژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- گۆت: خودێ گۆت: کوڕێ ئادەمی! هـندی تو داخوازێ ژ من بکـەی، وهیڤییـێ ژ من بکەی، د سـەر وێ ڕا یا تە کری، ئەز دێ گونـەهێن تـە ژێ بـەم، وئـەز ب چـو ڤـە وەرنـاگرم، کـوڕێ ئـادەمـی! ئـەگـەر گونـەهێن تـە بگـەهنـە عـەورێـن عەسمانی، پاشی تو داخوازا ژێبرنێ ژ من بکەی، ئەز دێ وان بۆ تە ژێ بەم، کوڕێ ئادەمـی! ئـەگـەر تـو بێییـە نـک مـن ب تـژی عـەردی گونـەهـ ڤـە، پاشـی ڕابـەری مـن بـی وتـە چـو شـریک بـۆ مـن چـێ نـەکربن، ئـەز ب تـژی عـەردی لێبۆرین ڤە دێ ئێمە نک تە.

ترمذی ڤەدگوهێزت

مەزنیا ڤێ حەدیسێ ژ هندێ دئێت، ئەو مەزنیـا تـەوحیـدا خـودێ بـۆ مـە بەرچاڤ دکەت، وگرنگیا خۆ دویرکرنـا ژ شرکێ، هـەر وەسـا ئـەو دوعـا وتۆبـە وئستغفاران ل بەر مە شرین دکەت، وبەرفرەهیا رەحم ودلۆڤانیا خـودێ بـۆ مـە

ئاشكەرا دكەت، دا ئەم بێ هیڤی نەبین، وگونەھـ مە ژ هندێ سست نەکەن کو ئەم ل خودێ بزڤڕین، ودوعایان بۆ خۆ ژ وی بکەین.

وچەند ئەگەر هەنە گونەهێن مرۆڤی پێ دئێنە ژێبرن، ژ وان یێن کو ژ ڤێ حەدیسێ دئێنە وەرگرتن:

١- کرنا دوعایێ:

ودوعا کاکلکا عیبادەتییە، چونکی ئەو نیشانا خۆشکاندن وهەوجەییا مرۆڤیە بۆ خودێ، هەر وەسا ئەو ئعترافەکا ئاشکەرایە ژ مرۆڤی ب خوداینیا خودێ، وکو ب تنێ ئەوە دشێت د هەوارا مرۆڤی بێت، ومرۆڤی ژ هەمی ڕەنگێن تەنگاڤیان بپارێزت.

٢- هیڤی:

بەلکی گونەهێن مرۆڤی گەلەک بن، بەلێ ئەو چەند بن ئەو ژ ڕەحما خودێ پتر نابن، و ژ مەغفرەتا وی بەرفرەهتر نابن، لەو دڤێت هەمی گاڤان مرۆڤ یێ ب هیڤی بت، ویا دورست ئەوە د گەل ڤی هیڤیێ ترس ژی هەبت، دا مرۆڤ بێ منەت نەبت.

٣- ئستغفار:

ومەعنا ڤێ ئەوە مرۆڤ داخوازا ژێبرنا گونەهان بۆ خۆ ژ خودێ بکەت، وژێ بخوازت کو ئەو وی ستارە بکەت، ولێ نەگرت ئەگەر جارەکێ ئەو بەر ب گونەهێ ڤە چوو.

٤- تەوحید وخۆ دویرکرنا ژ شرکێ:

وتەوحید ئەوە مرۆڤ هەمی ڕەنگێن عیبادەتی بۆ خودێ ب تنێ پێشکێش بکەت، وکەسێ نەکەتە شریکێ وی د ڤێ چەندێ دا، نە چو ملیاکەت وپێغەمبەران، ونە چو چاک ووەلیان.. هندی عیبادەتە بەس بۆ خودێ دئێتەکرن.

وکانێ چاوا تەوحید دبتە ئەگەرا ژێبرنا گونەهان، وەسا شرک دبتە ئەگەر پویچبوونا باشیان، وەکی دئایەتەکێ دا هاتی: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (الزمر: ٦٥) مەعنا: شرک ئێکا هند ژ خودانی چێ دکەت کو ئەو چو مفایی ژ کارێ خۆ یێ چاک نەبینت، و ژ مرۆڤێن خوسارەت بێتە هژمارتن.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە گرنگیا تەوحیدا خودێ د پەرستنێ دا ئاشکەرا دکەت.

٢- گونەهێ، ئەگەر چەند یا مەزن ژی بت، ئەگەرێن ژێبرنێ هەنە، ودڤێت چو جاران مرۆڤ ژ رەحما خودێ بێ هیڤی نەبت.

٣- گرنگیا دوعایێ وئستغفارێ ژی ژ ڤێ حەدیسێ ئاشکەرا دبت.

و ب ڤێ حەدیسێ ئەو حەدیس ب دویماهی دئێن یێن ئیمامێ نەوەوی -خودێ ژێ رازی بت- کۆم کرین.. وپشتی وان هەشت حەدیسێن دی هەنە، ئیمامێ ناڤدار (ئبن رەجەبێ حەنبەلی) لێ زێدە کرینە، د کتێبا خۆ (جامع العلوم والحکم) دا، ل ڤێرێ بۆ پتر مفایی ئەم دێ وان هەشت حەدیسان ژی شرۆڤە کەین.

## حەدیسا چل و سێیێ

عَـنْ ابْنِ عَبَّاسٍ - رَضِيَ الله عَنْهُما -، عَـنْ النَّبِيِّ -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- قالُ: ﴿أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: پشکا هەر ئێکی (ژ میراتی) بدەنێ، وئەوا دمینت بۆ نێزیکترین زەلامیە بەحسێ وی هاتیەکرن.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

ئەڤ حەدیسە بەحسێ پشک وبارێن میراتی دکەت، دەمێ ل سەر میراتگران دئێنە لێکڤەکرن.. وتشتەکێ ئاشکەرایە کو میراتێ مرۆڤێ دمرت، خودێ د قورئانێ دا لێکڤەکریە، ونەهێلایە ب هیڤیا مە وئجتهادا مە ڤە، تشتێ گرنگیا ڤێ مەسەلێ ڕادگەهینت.

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ئەو پشک ونەصیبێن خودێ د کیتابا خۆ دا ئاشکەرا کرین، کو نیڤە، ونیڤا نیڤێیە (چارێک)، ونیڤا وێ (هەشتێک)، ودوسێئێک، ونیڤا وان سێئێک، ونیڤا وێ (شەشێک)، وئەوا دمینت ژ میراتی، هوین بدەنە نێزیکترین زەلامی بۆ مری کو دبتە (عەصەبە) وەکی زانایێن فقهێ میراتی دبێژنێ.. وئەڤە کو ئەو میراتێ زێدە دبت بۆ عەصەبەیە، تشتەکە د ئایەتان دا نەهاتیە، ڤێجا دەمێ ئەم ڤێ حەدیسێ ددانینە بەر ئایەتێن میراتێ ئەوێن د سوورەتا (النساء) دا هاتین، مەسەلا لێکڤەکرنا میراتی ئاشکەرا دبت.

**مفايێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە تەئکیدێ ل سەر هندێ دکەت کو دڤێت پشکا هەر ئێکی ژ میراتی -وەکی د قورئانێ دا هاتی- بۆ بێتەدان، ونابت ب چو هێجەتا هەبت، بارا کەسێ ژ میراتی -بێی وی- بێتە خوارن.

٢- ئەوا زێدە دبت ژ میراتی، پشتی لێکڤەکرنا وی ل دویڤ نەصیبان، بۆ عەصەبەی دئێتەدان، کو نێزیکترین زەلامە بۆ مری.

## حەدیسا چل و چارێ

عَنْ عَائِشَةَ – رَضِيَ الله عَنْها – قالت: قَالَ رَسُولُ الله –صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ–: ﴿الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ﴾.

**رواه البخاري ومسلم**

ژ عائیشایێ -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: شیردان وێ حەرام دکەت یا بوون حەرام دکەت.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

مەعنا: ئەو تشتێ ب رێکا بوون ونەسەبێ ل سەر مرۆڤی حەرام دبت، هەر ئەو ب رێکا دانا شیری ژی ل سەر وی حەرام دبت، وئەڤە ئیشارەتە بۆ مەسەلا شویکرن وژنئینانێ.

وئاشکەرایە کو د شریعەتی دا هندەک ژن هەنە، ل سەر مرۆڤی حەرامە وان مارە بکەت، ژ بەر وێ پەیوەندیا نەسەبێ یا ب رێکا بوون ومرۆڤاینییێ د ناڤبەرا مرۆڤی ووان دا هەی، وئەو ژن دو رەنگن:

ئێک: ئەو ژنێن بۆ مرۆڤی حەرام حەرامبوونەکا هەر وهەر، ئەگەر ب تنێ ژی بن، وئەڤە دو پشکن:

أ- ئەوێن ژ بەر نەسەبێ ب تنێ حەرام دبن، وەکی: دەیک وهندی بلند ببت، وکچ وهندی نزم ببت، وخویشک وهندی نزم ببت، ومەت وخالەت یێن وی وییێن دەیک وبابێن وی.

ب- ئەوێن ژ بەر نەسەبێ د گەل خزمـاینییێ حەرام دبن، وەکی: ژنبابێ وهندی بلند ببت، وبویک، وخەسوی وهندی بلند ببت، ونەڤسیا وی ژ وێ ژنێ یا هاتیە ڤەگوهاستن وهندی نزم ببت، وژنێن نەڤسییێن وی.

وڤی رەنگی ب هەرد پشکان ڤە ژن وزەلام تێدا دپشکدارن.

دو: ئەو ژنێن بۆ مرۆڤی حەرام حەرامبوونەکا هەر وهەر، ئەگەر پێکڤە بن، وئەڤە ب نسبەت زەلامی ب تنێیە، چونکی ژنێ دو مێر پێکڤە نابن! و ژ ڤی رەنگیە: کۆمکرنا د ناڤبەرا وان هەردو ژنان دا یێن کو ئەگەر ئێک ژ وان زەلام با چێ نەدبوو یا دی شوی پێ بکەت، وەکی دو خویشکان، وژنێ وخالەتا وێ یان مەتا وێ.

ئەڤە ئەو ژنن یێن مارەکرنا وان ب رێکا نەسەبێ بۆ مرۆڤی حەرام دبن، وئەگەر مە ئەڤە زانی، دێ بۆ مە ئاشکەرا بت کو هەر ئێکا وەکی ڤان ب رێکا شیری ژی بگەهتە مرۆڤی بۆ مرۆڤی یا حەرامە، یەعنی -بۆ نموونە- ئەگەر ژنەکێ شیر دابتە کورەکی ئەو ل سەر وی حەرام دبت؛ چونکی دبتە دەیکا وی، وکچێن وێ دبنە خویشکێن وی، وخویشکێن وێ دبنە خالەتێن وی.. وهۆسا.

بەلێ جوداییەک ل ڤێرێ هەیە، ئەو ژی ئەڤەیە: حەرامبوونا ب رێکا شیری ژ وی مرۆڤی یێ شیر ڤەخواری بۆ عەیالێ وی دچت، بەلێ بۆ خویشک وبرا، ودەیک وباب، وخالەت وخال، ومەت ومامێن وی ناچت، یەعنی: ئەگەر کورەکی شیرێ ژنەکێ خوار ئەو دبتە کورێ وێ، وکورێ وی دبتە نەڤیێ وێ، بەلێ برایێ وی نابتە کورێ وێ، وخویشکا وی نابتە کچا وێ.. وهۆسا.

**مفایێ حەدیسێ:**

ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت کو ئەو حەرامیا نەسەب پەیدا دکەت، دانا شیری ژی پەیدا دکەت.

## حەدیسا چل و پێنجێ

عَـنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله -رَضِيَ الله عَنْهما- أَنَّهُ سَمِعَ رَسُول الله -صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ- يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ وَهُـوَ بِمَكَّـةَ: ﴿ إِنَّ الله وَرَسُـولَهُ حَـرَّمَ بَيْـعَ الخَمْـرِ وَالْمَيْتَـةِ وَالخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ ﴾ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ الله، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: ﴿ لَا، هُوَ حَرَامٌ ﴾ ثُمَّ قَـالَ رَسُـولُ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- عِنْدَ ذَلِكَ: ﴿ قَاتَلَ الله الْيَهُودَ، إِنَّ الله لَمَّا حَـرَّمَ شُـحُومَهَا جَمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ جابرێ کورێ عەبدللاهی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: ل سالا مەکەهـ هاتیە ڤەکرن من گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بوو ل مەکەهێ گۆت: هندی خودێ وپێغەمبەرێ ویە فرۆتنا مەیێ ومراری وبەرازی وصەنەمان حەرام کریە. ئێکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بەزێ مراری مفا ژێ دئێتە وەرگرتن، د گەمیان ددەن، وچەرمی پێ دۆن ددەن، ومرۆڤ وی بۆ رۆناهیێ ب کارئینان دئینن؟ وی گۆت: نە، ئەو یێ حەرامە. پاشی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: خودێ جوهیان بکوژت! خودێ بەز ل سەر وانحەرام کر، ئینا وان ئەو حەلاند، پاشی فرۆت، وبهایێ وی خوار.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- د ڤێ گۆتنا خۆ دا دو مەسەلێن گرنگ بۆ مە بەرچاڤ دکەت:

یا ئێکێ: حەرامیا فرۆتنا مەیێ (وئەو هەر ڤەخوارنەکە یا هشێ مرۆڤی ژ سەری دبەت) وحەیوانێ بێی ڤەکوشتن مرار دبت، وبەرازی، وصەنەمان.. ئەڤ تشتە د شریعەتی دا دحەرامن، وهەر تشتەکێ ب کارئینانا وی یا حەرام بت فرۆتنا وی ژی یا حەرامە.

یا دووێ: تاوانا وان کەسان ئەوێن فەند وفێلان دکەن، ولێ دگەڕیێن وەربادانێ بێخنەد مەسەلان دا، وتشتێ حەرام بۆ خۆ حەلال بکەن، وئەڤە حالێ جوهیان بوو د گەل دینێ وان، دەمێ خودێ تشتەک ل سەر وان حەرام کربا، ئەو لێ دگەڕیان ب هندەک ڕێکێن چەپ وچویر فایدەی ژ وی تشتێ حەرام وەربگرن! وەکی بەزێ حەیوانی، ژ بەر زێدەگاڤیا وان خودێ ئەو ل سەر وان حەرام کر، ئینا دا ڕابن بەزی حەلینن وبەن فرۆشن ووی پارەی خون.

ومخابن ئەڤ سالۆخەتێ کرێتێ جوهیان نوکە د ناڤ ئوممەتا مە ژیدا پەیدا بوویە، ودێ بینی هندەک کەس لێ دگەڕیێن ب هەر شوبهەیەکا هەبت، یان حەتا ب فەتوایا نەزانان، تشتێ حەرام بۆ خۆ حەلال بکەن، وئەڤە کارەکێ نەدورستە، وپێلێدانا ئەمرێ خودێیە، لەو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- صەحابیێن خۆ ژ ڤێ چەندێ دانە پاش، وبۆ وان ئاشکەرا کر کو تشتێ خودێ ب کارئینانا وی حەرام کربت، فرۆتن ومفاوەرگرتنا ژ وی ژی حەرامە.

ونە ب گۆتن ب تنێ، بەلکی ب کریار ژی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤ قاعیدەیێ شەرعی بۆ صەحابیێن خۆ بنەجهـ کربوو، ئەحمەد ژ عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی ڤەدگوهێزت، کو ل ڕۆژا شەڕێ خەندەقێ موسلمانان کافرەک کوشت وکەلەخێ وی کەفتە دەستێ موسلمانان، ئینا کافران داخوازا کڕینا کەلەخێ زەلامێ خۆ کر، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- چو پارە وەرنەگرتن، وگۆتە صەحابیان: کەلەخێ وی بدەنڤێ، کەلەخێ وی یێ پیسە، وئەو پارەیێ پێ دئێتە وەرگرتن ژی یێ پیسە!

و ل سەر ڤی بناخەیی فقهزان قاعیدەیەکی دانن ئەو ژی ئەڤەیە: تشتێ ب کارئینانا وی حەرام بت، فرۆتنا وی ژی حەرامە.

وهەژیە بێژین: هندەک تشت هەنە، خوارنا وان حەرامە، بەلێ چونکی مفا ژێ دئێتە دیتن، فرۆتنا وان یا حەرام نینە، وەکی -بۆ نموونە-: صەی بۆ نێچیرێ یان زێرەڤانیێ، وطەیرێن نێچیرێ.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەو تشتێ خودێ حەرام کربت، فرۆتنا وی ژی حەرامە.

٢- پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نفرین ل وان کەسان کریە یێن وەربادانێ دئێخنە شریعەتێ خودێ، ولێ دگەڕیێن تشتێ حەرام بۆ خۆ حەلال بکەن.

٣- ئەو کەسێن ڤێ چەندێ دکەن، وەکی جوهیانە ئەوێن لەعنەت ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەران لێ هاتیەکرن.

# حەدیسا چل و شەشێ

عَـنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ -رَضِيَ الله عَنْه- أَنَّ النَّبِيَّ -صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ- بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ، فَسَأَلَهُ عَنْ أَشْرِبَةٍ تُصْنَعُ بِهَا، فَقَالَ: ﴿ وَمَا هِيَ؟ ﴾ قَالَ: الْبِتْعُ وَالْمِـزْرُ، فَقُلْتُ لِأَبِي بُرْدَةَ: مَا الْبِتْعُ؟ قَالَ: نَبِيذُ الْعَـسَلِ، وَالْمِـزْرُ نَبِيـذُ الـشَّعِيرِ. فَقَـالَ: ﴿ كُـلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ ﴾.

رواه البخاري

ژ ئەبوو مووسایێ ئەشعەری -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت کو پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەو هنارتە یەمەنێ، ئینا وی پسیارا هندەک ڤەخوارنان ژێ کر ل وێرێ دهاتنە چێکرن، وی گۆت: ئەو چ ڤەخوارنن؟ ئەبوو مووسای گۆتێ: ئەو (بتع ومزرن).. وپسیار ژ ئەبوو بوردەیی[1] هاتەکرن: ئەو چ ڤەخوارن بوون؟ وی گۆت: (بتع) ئاڤا هنگڤینی بوو، ومزر ئاڤا جەهی بوو، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: هەر تشتەکێ هشێن خودانی ببەت (وی سەرخۆش بکەت) یێ حەرامە.

بوخاری ڤەدگوهێزت

بەری حەجا خاترخواستنێ ل سالا دەهێ مشەختی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- هەردو صەحابییێن خۆ: ئەبوو مووسایێ ئەشعەری، وناڤێ وی یێ دورست عەبدللاهێ کورێ قەیسێ ئەشعەری یێ تەمیمیە، وموعاذێ کورێ جەبەلی

(١) ئەبوو بوردە، وناڤێ وی یێ دورست (حارث) یان (عامر) بوو، کورێ ئەبوومووسایێ ئەشعەریە، ووی ئەڤ حەدیسە ژ بابێ خۆ ڤەگوهاستیە.

هنارتنە وەلاتێ یەمەنێ؛ دا دینی نیشا وان بدەن، وحوکمی د ناڤبەرێ دا بکەن، وتشتێ ل بەر وان ئاسێ ببا، یان ئەو د حوکمێ وی دا کەفتبانە گومانێ دچوون پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دکر، وئێک ژ وان تشتان ئەڤە بوو: ل یەمەنێ خەلکی دو ڤەخوارن چێ دکرن، ئێک ژ جەهی، ویا دی ژ هنگڤینی، وئەبوو مووسا د حوکمێ وان دا کەفتە شکێ، لەو وی پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر کانێ ئەڤ ڤەخوارنە ددورستن یان نە؟ ویشتی پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- پسیارا وان ڤەخوارنان کری وکانێ ئەو چنە؟ بەرسڤەکا گشتی دایێ کو ئەو مفایی ژێ وەربگرن بۆ ڤان ڤەخوارنان، وهەر ڤەخوارنەکا دی یا هەبت، وگۆتێ: هەر تشتەکێ خودانی مەست وسەرخۆش (سەکران) بکەت، ومەستی ئەوە عەقل بێتەبرن، ئەو یێ حەرامە..

مەعنا ئەگەر و (عللەت) د حەرامییێ دا چوونا عەقلیە، وناڤێ ڤەخوارنێ یان تشتێ ژێ دئێتە چێکرن یا گرنگ نینە، وقورئان دەمێ بەحسێ حەرامیا ڤی ڕەنگێ ڤەخوارنێ دکەت، د سوورەتا (المائدة) دا ئایەتێن (٩٠-٩١)ێ ئاشکەرا دکەت کو ئەو تشتەکێ پیسە، و ژ کارێ شەیطانیە، وشەیطانی دڤێت ب ڕێکا وێ ویا قومارێ ژی، دوژمنی ونەڤیانێ د ناڤبەرا خەلکی دا پەیدا بکەت.. وڤەخوارنا عەقل پێ بچت ماکا هەمی خرابی وپیساتیانە؛ چونکی هەر خرابیەکا هەبت دبت د دویڤ دا بێت.

ودیارە تشتێ ئەبوو مووسا ب گومان ئێخستی د ڤان هەردو ڤەخوارنان دا ئەو بوو، ئەو د وەسا بوون ئەگەر مرۆڤەکی کێم ژێ ڤەخواربا سەرخۆش نەدبوو، بەلێ ئەگەر گەلەک ژێ ڤەخواربا ژ نوی سەرخۆش دبوو، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، وەکی د روایەتەکا دی دا هاتی، ئاشکەرا کر کو هەر تشتەکێ گەلەک ژێ خودانی سەکران بکەت، ڤەخوارنا کێمیا وی ژی حەرامە.

وئەو تشتێ عەقل پێ دچت دو ڕەنگن:

ئێک: ئەوێ عەقل پێ دچت، وخۆشیەک پێ دگەهتە خودانی، وەکی مەیێ، ب کارئینانا وی ئێکجار حەرامە.

دو: ئەو تشتێ عەقل پێ دچت، وچو خۆشی پێ ناگەهتە مرۆڤی، وەکی بەنجێ، ئەڤە ئەگەر بۆ چارەسەری ودەرمانی بت، زانایێنفقهی دبێژن: دورستە ئەو بێتە ب کارئینان.

و د مەسەلا حەرامیا وی تشتی دا یێ عەقل پێ دچت فەرق نینە ئەو تشت یێ رۆن بت یان یێ هشک بت، خوارن بت یان ڤەخوارن بت.. ئەو هەمی دحەرامن.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- هەر تشتەکێ عەقلێ مرۆڤی پێ بچت، خوارن وڤەخوارنا وی حەرامە.

٢- تشتێ مرۆڤ د حوکمێ وی دا بکەفتە گومانێ دڤێت پسیارا وی بۆ خۆ ژ ئێکێ زانا بکەت، بەری فەتوایێ بدەت.

٣- وەدەمێ پسیارەک ژ مرۆڤێ زانا دئێتەکرن یا باش ئەوە بەرسڤا وی یا گشتی بت، دا پسیارکەر مفایەکێ زێدەتر بۆ خۆ ژێ وەربگرت.

## حەدیسا چل و حەفتێ

عَـنْ الْمِقْدَام بْنَ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ -رَضِيَ الله عَنْه- قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقُولُ: ﴿ مَا مَلَأَ ابْنُ آدَمَ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبُ ابْنِ آدَمَ أُكُـلَاتٌ يُـقِـمْـنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لَا مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ لطَعَامِـه، وَثُلُـثٌ لِـشَرابِهِ، وَثُلُـثٌ لِنَفَسِهِ ﴾.

رواه الترمذي

ژ مـقـدامـێ کورێ مەعدیەکربی -خودێ ژێ رازی بت- دبێژت: مـن گوهـ ل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بـوو دگۆت: کـورێ ئـادەمـی ئامانـەکێ خرابتـر ژ زکی تژی نەکریە، وتێرا کورێ ئـادەمـی هـەیـە هنـدەک پـارییێن کـو پـشتا وی بگرن، وئەگەر وی هەر خـوار، بـلا سێیێک بـۆ خوارنـا وی بـت، وسێیێک بـۆ ڤەخوارنا وی، وسێیێک بۆ بێهنا وی.

ترمذی ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە بناخەیەکێ ساخلەمی ودختۆرییێ د نـاڤ خـۆ دا هـل دگـرت، ومـرۆڤێن زانـا ب سـاخلەمیـێ ودەرد ودەرمانـان دبێـژن: ئـەگـەر مـرۆڤ ڤـێ حەدیسێ ل سەر خۆ ب کار بینن، دێ ژ نـەخۆشیان پاراستی میـنن؛ چونکی مـەعیـدە مـالا دەردانـە، وپـارێز سـەرێ هـەمـی دەرمانانـە، دختـۆرێ عـەرەبـان حارثـێ کورێ کلدەی دبێژت: تشتێ مرۆڤ کوشتین، ودەهبە تێبرین، خوارنـا ل سەر خوارنێیە، بـەری ئـەو حـەل ببت. وباشـترین رەنـگ سـەرەدەرییێ د گـەل خوارنێ ئەوە -وەکی د حەدیسێ دا هاتی- مرۆڤ مەعیـدەیێ خـۆ بکـەتـە سـێ پشـک: پشکەک بۆ خوارنێ، وپشکەک بۆ ڤەخوارنێ، وپشکەک بۆ بێهنێ.

ئەڤە بۆ وی یێ نەشێت نەخوت، ژ خۆ ئەگەر ئەو بشێتە خۆ یا باشتر ئەوە ئەو هێشتا کێمترێ بخوت؛ چونکی کێم خوارن ساخلەمیا لەشی ودلیە ژی، وسەلەمەیێ کورێ سەعیدی بەحسێ صەحابیان دکەت، دبێژت: قەلەوی ل نک وان جهێ لۆمێ بوو وەکی گونەهێ! یەعنی: دەمێ ئێک ژ وان مرۆڤەکێ قەلەو دیتبا، ئەو ژ بەر قەلەوییێ د چاڤێنوان دا دشکەست، کا چاوا ئەو مرۆڤ د چاڤێن واندا دشکەست یێ گونەهـ دکرن.

وزانایێن خودایی ب دورستی ئەڤ شیرەتە ب کاردئینا، ژ ئیمامێ شافعی دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: ئەڤە شازدە سالە من هند نەخواریە کو تێر ببم، جارەکێ تێ نەبت ئەو ژی من هلاڤێت، چونکی تێری لەشی گران دکەت، وتێگەهشتنێ ناهێلت، وخەوێ دئینت، ومرۆڤی سست دکەت ژ کرنا عیبادەتی.

وپێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، وبنەمالا وی ژی -وەکی د حەدیسێن دورست دا هاتی- هند خوارن نەدخوار کو تێر ببن، عائیشا دبێژت: ئەڤە پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- هاتیە مەدینێ سێ ڕۆژا ل دویڤ ئێک وی هند نانێ جەهی نەخواربوو کو تێر ببت.

وئەگەر ئێک بێژت: بەلکی وی خوارن نەبوو بخوت لەوا.. دێ بێژین: ئەگەر خۆ وەسا ژی بت، خودێ وی تشتی بۆ پێغەمبەرێ خۆ هل دبژێرت یێ باشتر و ب خێرتر بۆ وی.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە بەرێ مە ددەتە زوهدێ د دنیایێ دا، وکێم خوارن ژ زوهدێیە.

٢- وئەگەر مرۆڤی هەر خوار، یا دورست ئەوە ئەو مەعیدەیێ خۆ بکەتە سێ پشک: ئێک بۆ خوارنێ، وئێک بۆ ڤەخوارنێ، وئێک بۆ بێهنێ.

## حەدیسا چل و هەشتێ

عَـنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو -رَضِيَ الله عَنْهما- قَالَ: قال رَسُولُ الله -صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-: ﴿ أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْ النِّفَاقِ، حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَـذَبَ، وَإِذَا عَاهَـدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ ﴾.

رواه البخاري ومسلم

ژ عەبدللاهێ کورێ عەمری -خودێ ژێ رازی بت- دبێـژت: پێغـەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: چار سالۆخەت هەنە هەچییێ ئەو ل نک بن ئەو خورِی منافقە، وهەچییێ ئێک ژ وان ل نک هەبت ئەوی سالۆخەتەکێ نفاقێ ل نـک هەیە حەتا ئەو وی دهێلت: دەمێ کەسەک باوەریا خۆ پێ دئینت ئەو خیانەتێ لێ بکەت، ودەمێ دئاخڤت درەوێ دکەت، ودەمـێ پـەیمانـەکێ ددەت غـەدرێ دکەت، ودەمێ هەڤرکییێ دکەت زێدەگاڤییێ دکەت.

بوخاری وموسلم ڤەدگوهێزن

نفاق سالۆخەتەکە ل سەر فێلبازی وخاپاندنێ راوەستت، وئـەو د ئـەصـل دا ئەوە مرۆڤ ب سەرڤە خۆ ب رەنگەکی نیشا خەلکی بـدەت، وراسـتیا وی د دل دا ب رەنگەکێ دیە، لەو ئەم ب کوردی دبێژینێ: دورِویاتی.. ومرۆڤـێ دورِوی کـەسـەکـە نـە خـودێ ونـە خـەلـک حـەز ژێ دکـەن، ودو رەنگێن نفـاقێ هەنە:

ئێک: نفاقا مەزن:

وئەڤە ئەوە یا خودان پێ کافر دبت، وەکی کو د دل دا باوەریێ ب خودێ وپێغەمبەری وئیسلامێ نەئینت، بەلێ ب سەرڤە وەسا خۆ نیشا خەلکی بدەت کو وی باوەری هەیە؛ دا ب ڤێ باوەریا ژ درەو ئەو مفایەکی بگەهینتە خۆ، یان زیانەکێ ژ خۆ بدەتە پاش. وقورئان رادگەهینت کو ئەڤ رەنگێ دورویان دێ چنە جهێ ژ هەمیان نزمتر ونەخۆشتر ل جەهنەمێ.

دو: نفاقا بچویکتر:

وئەڤە نفاقا عەمەلیە، یا کو مرۆڤی گونەهکار دکەت، بەلێ ئەصلێ ئیمانێ ژ نک وی نابەت، وچار بناخە بۆ ڤی رەنگێ نفاقێ هەنە، ئەو بۆ دزڤرت، ئەو ژی ئەڤەنە:

١- خیانەتا د ئێمانەتی دا:

هەر رەنگەکێ ئێمانەتی یێ هەبت.. دەمێ کەسەک باوەریا خۆ ب ئێکی بینت، تشتەکێ خۆ بدانتە نک، یان حەتا گۆتنەکێ بۆ بێژت، ئەو رابت خیانەتێ لێ بکەت، تشتێ وی بۆ نەزڤرینت، یان نهێنیا وی ئاشکەرا بکەت.

٢- درەوا د ئاخفتنێ دا:

دەمێ کەسەکی باوەری ب ئێکێ دی هەبت، ئەو بچت ئاخفتنەکا ژ درەو بۆ بێژت، دا بخاپینت، ئەڤە بناخەیێ هەر نفاقەکێیە، لەو دئێتە گۆتن: درەو ئەو بناخەیە یێ نفاق ل سەر دئێتە ئاڤاکرن.

٣- غەدرەیا د پەیمانێ دا:

وەکی کو مرۆڤەک سۆز وپەیمانەکێ بدەتە کەسەکی، وئەو ل دەمێ دانا ڤێ سۆزێ د دل دا دزانت کو ئەوڤێ سۆزا خۆ ب جهـ نائینت، یان پەیمانەکێ ددەتە کەسەکی وغەدرێ لێ دکەت ووێ پەیمانێ ب جهـ نائینت.. خودێ د قورئانێ دا فەرمانێ ل مە دکەت کو ئەم سۆزێن خۆ ب جهـ بینین، ووان عەقدان پێک بینین یێن ئەم ددەینە ئێکودو.

٤- زێدەگاڤیا د هەڤرکیێ دا:

ومەخسەد ب ڤێ ئەوە دەمێ ئەو هەڤرکیێ د گەل ئێکی دکەت، ژ قەستا ژ حەقیێ لاددەت، ونەحەقیێ دبێژت ودکەت دا هەڤرکێ خۆ بشکێنت وخۆ ب سەر بێخت، وتشتێ نە حەقێ وی بت بگەهینتە خۆ. ئەڤ زێدەگاڤیە ژی بناخەیەکێ نفاقێیە.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە مە ژ نفاقا عەمەلی ددەتە پاش.

٢- نفاقا عەمەلی چار سالۆخەت هەنە، د ڤێ حەدیسێ دا بۆ مە ئاشکەرا دبن، ئەو ژی ئەڤەنە: خیانەت، درەو، غەدر، وزێدەگاڤی.

# حەدیسا چل و نەهێ

عَـنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ -رَضِيَ الله عَنْه- قَالَ: قال رَسُولُ الله -صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ-: ﴿لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى الله حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّـيْرَ، تَغْـدُو خِمَاصًا، وَتَرُوحُ بِطَانًا﴾.

رواه الترمذي

ژ عومەرێ کورێ خەطـطـابی -خودێ ژێ رازی بت- دبێـژت: پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ئەگـەر هوین ب دورسـتی خۆ بهێلنـە ب هیڤیـا خـودێ ڤە، ئەو دێ رزقێ هەوە دەت کانێ چاوا رزقێ طـەیری ددەت، سپێدێ برسـی دەردکەڤت، وئێڤاری تێر دزڤرت.

ترمذی ڤەدگوهێزت

ئەڤ حەدیسە بناخەیە د مەسەلا خۆ هێلانا ب هیڤیـا خـودێ ڤـە دا، ئـەوا ب عـەرەبی دبێژنێ: (تەوەککول)، وئـەو ئاشکەرا دکـەت کـو تـەوەککـول ئێـک ژ مەزنترین ئەگەرێن ب دەسـتڤە هاتنـا رزقیـە، وڕاسـتیا تـەوەککـولێ ئـەوە دل پێ ڕاستگۆ بت دەمـێ خۆ دهێلـتـە ب هیڤیـا خـودێ ڤـە، وبزانـت کـو خودێیـە دشێت وی تـشتی بگـەهینـتـێ یـێ مفـایێ وی تێـدا هـەی، وئـەوە دشـێت وی تشتی ژێ بدەتە پـاش یـێ زیانـا وی تێـدا هـەی، ڤێجـا مـادەم هۆیـە بـلا ئـەو کارێ خۆ هلپسێرتە وی ب تنێ، وخۆ ب هێلتە ب هیڤیا وی ب تنێ ڤە.

ودەمێ ئەم دبێژین: دڤێت مرۆڤ خۆ بهێلتە ب هیڤیا خودێ ب تنێ ڤـە، مـەعنـا ڤێ گۆتنێ ئەو نینە هەما ئەو ڕوینتە خوارێ، ووان ئـەگـەرێـن مـاددی

ب کار نەئینت یێ خودێ دانایین وفەرمان ب جهئینانا وان کری، وئەگەر مرۆڤ هزرا خۆ د وێ نموونەیێ دا بکەت ژی یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئینای ئەڤ چەندە بۆ مە باش ئاشکەرا دبت، طەیر دەمێ لێ دبتە سپێدە ویێ برسی، ئەو د هێلینا خۆ دا نارِوینت، بەلکی دەردکەڤت ودچت بۆ خۆ ل رزقی دگەرِیێت، لەو ئێڤاری دزڤرتە هێلینا خۆ تێر.. مەعنا: هوین ژی گەلی مرۆڤان، وان ئەگەران ب کار بینن یێن خودێ ئینانا رزقێ هەوە پێڤە گرێدای، بەلێ گەلەک خەمێ ژ رزقێ پاشەرِۆژێ نەخون، چونکی ئەو ل نک خودێ یێ نڤیسیە.

و ژ ڤێ حەدیسێ دیار دبت کو گەلەک مرۆڤ هەنە ب دورستی خۆ ناهێلنە ب هیڤیا خودێ ڤە، و د تەوەککولێ ناگەهن، وهزر دکەن هەما ئەگەرێن ماددی ب تنێنە رزقی ب دەست خودانی دئێخن، وقەدەرا خودێ یا د پشت ئەگەران را هەی ژ بیر دکەن، لەو دێ بینی ئەو خۆ ب ئەگەران ڤە زێدە دوەستینن، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو رزق ب تنێ دگەهتە وان یێ خودێ بۆ نڤیسی، و د حەدیسەکێ دا یا ترمذی ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت هاتیە کو زەلامەکی پسیار ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کر: ئەز حێشترا خۆ گرێدەم وبهێلمە ب هیڤیا خودێ ڤە، یان بەردەم وبهێلمە ب هیڤیا خودێ ڤە؟ گۆت: گرێدە وبهێلەب هیڤیا خودێ ڤە.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەگەر مرۆڤ د هەمی کارێن خۆ دا خۆ بهێلتە ب هیڤیا خودێ ڤە، ئەو رزقێ وی دێ دەت.

٢- تەوەککول مەعنا وێ ئەو نینە مرۆڤ ئەگەرێن ماددی ب کار نەئینت وهەما روینتە خواری وبێژت: خودێ رزقی دێ دەت.

٣- ئەوێ خۆ ب ئەگەرێن ماددی ب تنێ ژی ڤە گرێدەت، مەعنا وی باوەری ب قەدەرا خودێ نینە.

## حەدیسا پێنجیێ

عَـنْ عَبْدِ الله بْنِ بُسْرٍ -رَضِيَ الله عَنْه- قَالَ: قَـالَ أَتَـى النَّبِـيَّ -صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ- رَجُلٌ فَقَالَ: يا رسولَ الله، إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَبَابٌ نَتَمَسَّكُ بِهِ جَامِعٌ، قَالَ: ﴿ لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ الله ﴾.

رواه أحمد

ژ عەبدللاهێ کورێ بوسری -خودێ ژێ رازی بت- گۆت: زەلامەک هاتـە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- وگۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خـودێ، شریعەتێن ئیسلامێ ل من زێدە بوون، دەرگەهەکێ کۆمکەر بۆ مـن بێـژە ئـەز خۆ پێڤـە بگرم، وی گۆت: بلا ئەزمانێ تە هەرێ تەڕ بت ژ زکرێ خودێ.

ئەحمەد ڤەدگوهێزت

بەری نوکە و د پتر ژ حەدیسەکێ دا بەحسێ زکرێ خودێ، وبهایێ مەزنێ هندەک زکری هاتیە، و د ڤێ حەدیسا دویماهیێ دا بـەحسێ قـەنجی وبهـایێ بەردەوامیا ل سەر زکری دئێتەکرن.

د گەلەک حەدیسان دا هاتیە کـو ژ سالۆخەتێن پێغـەمبەری -سلاڤ لـێ بن- ئەو بوو وی د هەمی حالێن خۆ دا زکرێ خودێ دکر، و د حـەدیسەکێ دا یا موسلم ژ ئەبوو هورەیرەی ڤەدگوهێزت هاتیە کو جارەکێ پێغـەمبـەر -سـلاڤ لێ بن- د گەل صەحابیێن خۆ ل وەغەرەکێ بوون، ئەو د چیایەکی ڕا دەربـاس بوون، دگۆتنێ: چیایێ (جومدان)، ئینا پێغـەمبـەری -سلاڤ لـێ بـن- گـۆت: بـدەنـە رێ ئـەڤـە جومدانـە، ویـێن (موفـەررد) بـەرێ ڕاکریـە.. گـۆتن: ئـەی

پێغەمبەرێ خودێ موفەررد کینە؟ وی گۆت: ئەون یێن گەلەک زکرێ خودێ دکەن.

وهلکەفتنا ڤێ گۆتنێ د ریوایەتەکا دی دا پتر بۆ مە ئاشکەرا دبت، موعاذ دبێژت: دەمێ ئەم گەهشتینە چیایێ جومدان، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتە من: کانێ ئەوێن بەری مە ڕاکری؟ من گۆت: یێن چووین وخەلکێ ل پشت خۆ هێلاین.. گۆت: وی گۆت: ئەی موعاذ، یێن بەرێ ڕاکری ئەون یێن گەلەک زکرێ خودێ دکەن.

یەعنی: سباقا دورست ئەو نینە مرۆڤ بەری خەلکی ڕاکەت، ووان ل پشت خۆ بهێلت، بەلکی سباقا دورست ئەوە مرۆڤ بەردەوام زکرێ خودێ بکەت، هنگی ئەو دێ بەری خەلکی ڕاکەت وقەستا جهێن خۆش ل بەحەشتێ کەت.. وعومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی ژی -خودێ ژێ رازی بت- ئیشارەت بۆ ڤێ چەندێ دابوو دەمێ دا حەجی ژ عەرەفێ ڤەرەڤن پشتی ڕۆژ ئاڤا بووی، وی دیت هەر ئێک یێ لەزێ دکەت دا بەری هەڤالێ خۆ ڕاکەت، وی گۆت: ئەوێ بەرێ ڕادکەت نە ئەوە یێ حێشترا وی زویتر بچت، بەلکی ئەوە یێ دچت وگونەهێن وی بۆ هاتینە غەفراندن.

ودا مرۆڤ د هەمی دەمێن خۆ دا خودێ ل بیرا خۆ بینتەڤە، پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ هەر حال وکارەکی زکرەکێ تایبەت دەسنیشان کریە، دەمێ مرۆڤ ژ خەو ڕادبت، دەمێ دنڤت، دەمێ خوارنێ دخوت، خۆ دەمێ دچتە دەستاڤێ، وژێ دەردکەڤت ژی! دا چو دەمان ئەو دویر ژ خودێ نەژیت.

وهەما بەسە بێژین: خودایێ مەزن د قورئانێ دا دەمێ بەحسێ منافقان دکەت، دبێژت: ﴿ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ ﴾ (النساء: ١٤٢) یەعنی: کێمەکێ تێ نەبت ئەو خودێ ل بیرا خۆ نائینن ڤە، وهەر ژ بەر ڤێ چەندێ هندەک پێشییێن ڤێ ئوممەتێ دگۆت: هەچییێ گەلەک زکرێ خودێ بکەت دێ یێ بەری بت ژ نفاقێ.

وئـبن حببـان ژ موعـاذێ كـوڕێ جـبـەلـی ڤـەدگـوهێزت، دبێـژت: تـشتێ دویماهیێ یێ منژ پێغەمبەری گوهـ لێ بووی، وپشتی هنگی من ئـەو نـەدیتـە ڤە، ئەو بوو من گۆتێ: كارێ ژ هـەمیـان باشـتر ومرۆڤـی پتـر نێزیكـی خـودێ دكەت چیە؟ وی گۆت: كو تو بمری وئەزمانێ تە یێ تەڕ ژ زكرێ خودێ.

**مفایێن حەدیسێ:**

١- ئەڤ حەدیسە هندێ دگەهینت كو دەرگـەهـێ كۆمكـەر بـۆ خێـرێ ئـەوە مرۆڤ بەردەوام زكرێ خودێ بكەت.

٢- كو ئەزمانێ مرۆڤی هەردەم یێ تەڕ بت ب زكرێ خودێ ئـەو باشـترین كارە مرۆڤ دكەت.

هیڤیا مە ژ خودێ ئەوە ئەو بەردەوامیا زكری ب رزقێ مە بكەت،

ودەمێ ئەو مە دمرینت ئەم بمرین وئەزمانێ مە یێ تەڕ

بت ب زكرێ وی.. وحەمد بۆ وی خودایی بن

یێ تەوفیقا مە دای بۆ تمامكرنا

ڤی كاری.

# ناڤەرۆك

حەدیسا شازدێ: لَا تَغْضَبْ.

حەدیسا هەڤدێ: إِنَّ الله كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ..

حەدیسا هەژدێ: اتَّقِ الله حَيْثُمَا كُنْتَ ..

حەدیسا نۆزدێ: يَا غُلاَمُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ..

حەدیسا بیستێ: إِنَّ مِـمّـَا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى..

حەدیسا بیست وئێكێ: قُلْ آمَنْتُ بِالله ثم اسْتَقِمْ..

حەدیسا بیست ودووێ: أَرَأَيْتَ إِذَا صَلَّيْتُ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ..

حەدیسا بیست وسێیێ: الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ..

حەدیسا بیست وچارێ: يَا عِبَادِي، إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي..

حەدیسا بیست وپێنجێ: أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ الله لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ..

حەدیسا بیست وشەشێ: كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ..

حەدیسا بیست وحەفتێ: الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ..

حەدیسا بیست وهەشتێ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى الله، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ..

حەدیسا بیست ونەهێ: لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيمٍ..

حەدیسا سیهێ: إِنَّ الله -عَزَّ وَجَلَّ- فَرَضَ فَرَائِضَ فَلاَ تُضَيِّعُوهَا..

حەدیسا سیه و ئێكێ: ازهَدْ في الدُّنيا يحبَّكَ الله..

حەدیسا سیه و دووێ: لا ضَرَرَ ولا ضِرارَ.

حەدیسا سیه و سێیێ: لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ..

حەدیسا سیه و چارێ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ..

حەدیسا سیهـ و پێنجێ: لاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا..

حەدیسا سیهـ و شەشێ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا..

حەدیسا سیهـ و حەفتێ: إِنَّ الله كَتَبَ الحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ..

حەدیسا سیهـ و هەشتێ: إِنَّ الله قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا ..

حەدیسا سیهـ و نەهێ: إِنَّ الله تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الخَطَأَ..

حەدیسا چلێ: كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ..

حەدیسا چل و ئێکێ: لا يُؤمِنُ أَحدُكُم حتّى يكونَ هَواهُ تَبَعاً لِما جِئتُ بِهِ.

حەدیسا چل و دووێ: قالَ الله: يا ابنَ آدمَ، إنَّك ما دعوتَني ورجوتَني..

حەدیسا چل و سێیێ: أَلحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا..

حەدیسا چل و چارێ: الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ.

حەدیسا چل و پێنجێ: إِنَّ الله وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الخَمْرِ..

حەدیسا چل و شەشێ: فَسَأَلَهُ عَنْ أَشْرِبَةٍ تُصْنَعُ بِهَا، فَقَالَ: وَمَا هِيَ؟

حەدیسا چل و حەفتێ: مَا مَلأَ ابْنُ آدَمَ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ..

حەدیسا چل و هەشتێ: أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا..

حەدیسا چل و نەهێ: لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى الله حَقَّ تَوَكُّلِهِ..

حەدیسا پێنجیێ: لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ الله.